# مەلا ئەحمەدی کۆر

## ئەستێرەیەکی درەوشاوەی ئاوایی ئۆمەر گومبەت

١٨٢٥ - ٢٠١٦

نووسین و ئامادەکردنی
سیروان سەرگەڵوویی

پێداچوونەوە
سەرکەوت محەمەد نەجیب

٢٠١٨

مەلا ئەحمەدی کۆر

زاتێ زۆر گەورە بوو، ئەتوانم بڵێم بە حەق (وەلی) بوو، تەمەنی لە شەرع و تەقوا ڕابوارد...

**( مەلای گەورە )**

# مەلا ئەحمەدی کۆر

## ئەستێریەکی درەوشاوەی ئاوایی ئۆمەر گومبەت

### کورتەیەک لە ژیانی، عاریفان، زانایان، ناوداران و ڕۆشنبیرەکانی بنەماڵەی دەربەندی

### ١٨٢٥ – ٢٠١٦


نووسین و ئامادەکردنی

سیروان سەرگەڵوویی

پێداچوونەوە

سەرکەوت محەمەد نەجیب



چاپی یەکەم

کەرکوک – ٢٠١٨



ناوی کتێب: مەلا ئەحمەدی کۆر ( ئەستێرەیەکی درەوشاوەی ئاوایی ئۆمەر گومبەت)

بابەت: لێکۆڵینەوەی مێژوویی

نووسین و ئامادەکردنی: سیروان سەرگەڵوویی

پێداچوونەوە: سەرکەوت محەمەد نەجیب

دەرهێنانی هونەری: ئومێد جاف

چاپخانە: کارۆ

تیراژ: (٧٥٠) دانە

چاپ: چاپی یەکەم

ساڵی چاپ: ٢٠١٨ – کەرکوك

لە بەڕێوبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە ( ١٩٥٧) ی ساڵی ٢٠١٧ ی پێدراوە.



ئەحمەدی کۆر بەس خەیاڵکە

حوبی دونیایەت لێ بەتاڵکە

پێکەوە نابێ دوو هەوێی

یەک بگرەو یەک بەڕەڵاکە

وەلەو نەمدیبوو مـن ئەحمەدی کوڕ

بـەر لـە مـن بـووە زەمانێکی زۆر

وەك مێژوو دەڵێ پیـاوێ چـاك بووە

زانـا و خوانـاس، زۆر دڵپـاك بـووە

هەڵبـەستەکـانی بـەرز و پڕ مەعنا

گـەلێ بەنـرخـن لای پیـاوی دانـــا

نەوەی ئەو بـووە مـەلا محەمەد نوور

لەهەر شوێن ناسراو لە نێزیك و دوور

لە مەیدانی بەلاغەتدا ژیر و هۆشیار

لە عیلـمی زاهیـر و بـاتین خەبەر دار

بە چەند جـۆر زمـان شیعری وتـووە

دەریـای زانـیاری عەسـری خۆی بـووە

عـارف و کامـل لـە ئـموری دیــن

زۆر بـە ویـقـار و بـەڕێـز و سەنگین

ژیـانـی ئـەم دوو پیـاوە زانـایـە

بە هەوڵی چـەند کـەس هاتۆتە کایـە

کـاك (شێخ سیروان)یش کۆی کردۆتـەوە

دیـارە سـەر گـوڵی خـۆی بـردۆتـەوە

شێخ عوبێد شێخ لەتیف بەرزنجی

(هەوری)

کەرکووك ٢٠١٧/١٠/١٠

# پێشەکی

خوێنەری ئازیز: گەر تەماشای ڕابردووی زانایان و شاعیران و ناودارانی گەلی کورد بکەین، هەر یەکەیان لە لوتکەیەکی دیاری بواری زانست و زانیاری و ئایینی و ڕۆشنبیری و ڕامیاری و کۆمەلایەتی و سیاسی بۆ خۆیان بەدەست هێنا بوو، کە ئەمڕۆ ئێمە و خوێنەرانی کورد سوودی لێ دەبینین، کاتێ تەماشای ژیانی یەکێك لەم کەسایەتییانە دەکەی ئەوەت بۆ دەردەکەوێ کە کاتیان بە فیڕۆ نەداوە و خۆیان بە بەرپرس زانیوە بەرامبەر بەگەل و ڕۆڵەکانی نەتەوەی کورد.
ئەگەرچی لەو سەردەمە نووسینەوە و خوێندنەوە بە زمانی کوردی زۆر ئەستەم بوو، چونکە بەدرێژایی مێژوو نەیاران و ناحەزانی کورد هەمیشە لەسەنگەر بوونە بەرامبەر بە خاك و نیشتمانی جوانی کوردستان، بۆیە دەبینین مێژووی زانایان و ناودارانی کوردی ستەمدیدە فرامۆشکراوە و وەك پێویست زانیاری ئەوتۆ لەسەریان نەنووسراوە، وەك ئاماژەم پێدا ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ستەم و ناحەقییانەی کە بەرامبەر بە کورد و نەتەوەی کورد کراوە.
سەرەڕای ئەو نەهامەتی و کەم و کورتییانە، زانایان و ڕۆشنبیران و شاعیرانی کورد نەیان هێشتووە زوبان و مێژووی کورد وەلا بنرێت، بۆیە خزمەتی ئەوانە ئەمڕۆ بە هەزاران کتێب لە بواری ئایین و زانست و شیعرو مێژوو ئەدەب و تەسەوف و.........هتد، خستۆتە نێو کتێبخانەی کوردی.

جا بابێمە سەر باس و خواسی ئەم کتێبە، لە ڕاستیدا بیرۆکەی ئەم باسە بۆ برای بەڕێزم کاك سەرکەوت دەگەڕێتەوە، بەڕێزیان لە ڕێکەوتی (٢٥ / ٤ / ٢٠١٦) هاتە (کۆمەڵەی ڕووناکبیری و کۆمەلایەتی کەرکوك)، ئەوە بوو برای شاعیرو نووسەر کاك خالید کاوێس بە یەکتری ناساندین و وتی: ئەمە کاك (سەرکەوت) ە، هاوڕێمە و بەیەکەوە پێشمەرگە بووین، منیش بە ناسینی بەڕێزیان زۆر خۆشحاڵ بووم، دواتر وتی: هەندێ زانیاری لەسەر باوك و باپیرانی کۆکردۆتەوە، بە تایبەتی لەسەر ژیاننامەی مەلا ئەحمەی کۆر و مەلا نور محەممەد و حاجی مەلا محەممەد نور و مەلا عەبدوڵڵا و هەندێ شیعری جۆراوجۆر کە بریتی بوو لە (٢٠) لاپەڕە، بەنیاز بوو لە گۆڤاری (بانە ڕۆژ) بلاوی بکاتەوە، منیش کە تەماشای ناوەڕۆکی

ئەو بابەتەم کردو چاوێکم پیاخشاند، هەرچەن پاکنووس نەکرابوو بەڵام زانیاری باشی لە خۆگرتبوو،ماندوو بوونی پێوە دیار بوو، دواتر پێشنیارم کرد ئەم بابەتە پەرەی پێ بدرێت و بکرێت بە کتێب، کاك سەرکەوت وتی زۆر باشە بیرۆکەیەکی جوانە.

پاشان هەڵسام سەر لە نوێ بەدارشتنەوەی سەرجەم ئەو زانیارانە و کۆکردنەوەی سەرچاوەی زیاتر بۆ دەوڵەمەند کردنی ئەم کتێبە.

دەبێ ئەوە بڵێم لەبارەی ئەم کتێبەوە بەردەوام لەگەڵ برای بەرێز کاك سەرکەوت لە گفتوگۆدا بووین، رۆژێك پێی وتم: مامێکم هەیە بە ناوی مەلا ئەحمەد هەرچەند بەساڵاچووە و تەمەنی نزیکەی (١٠٠) ساڵ دەبێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بیروهۆشی لەسەر خۆی ماوە و زانیاری زۆری لەلایەو لەو بڕوایەم بۆ ئەم پرۆژیە سوودبەخش بێت، منیش زۆرم پێ خۆش بوو، بۆ ئەو مەبەستە پێم باش بوو بە زووترین کات چاوم پێ بکەوێ و بە دیداری شادبم، ئەوە بوو رۆژێکمان تەرخان کرد و لە رێکەوتی (٩ / ٦ / ٢٠١٦) سەردانی ماڵی مامۆستا مەلا ئەحمەدمان کرد لە دارەتوو– هەولێر، کاتژمێر ( ١٥ - ١٠) ی سەر لە بەیانی چووینە ماڵی مەلا ئەحمەد.

وا دیار بوو پێشتر کاك سەرکەوت لەگەڵ مامی لەبارەی ئەم پرۆژیە قسەی کرد بوو، کەوا کورێك بە ناوی سیروان دێت و دەیەوێ چاوی پێت بکەوێ و خۆشی سەر بە بنەماڵەی (سەید ئەحمەدی خانەقا) یە، ئەوە بوو چووینە خزمەت مەلا ئەحمەد، کاتێ چاوم پێ کەوت دەبینم پیاوێکی پاك و جوان و جلوبەرگی کوردی رانگوچۆغەی قاوەیی لەبەر بوو، هەروەها بینیم دیوانی (حاجی قادری کۆیی) بە دەستێوەیەو دەیخوێنێتەوە، پاش سڵاو کردن لە مامۆستا، کاك سەرکەوت وتی: ئەمە کاك سیروانە کە بۆتم باسکرد.

ئەویش زۆر بەگەرمی پێشوازی لێم کردو وتی: یاخوا بەخێربێت و بۆنی خانەقات لێ دێ و زۆر خۆشحاڵم، پاشان فەرمووی ئێمە لەگەڵ خوالێخۆشبوو (سەید ئەحمەدی خانەقا) زۆر تێکەڵ بووین، هەر لە زەمانی باپیرم (مەلا ئەحمەدی کۆر و باوکم حاجی مەلا محەمەد نور)، کە زۆر دۆستی یەکتری بوون و بیرەوەری و یادگاریم زۆرە لە خانەقا، یاخوا بەخێربێت وەڵڵاهی زۆر کەیف خۆش بووم بە هاتنت.

منیش عەرزم کرد قوربان ئێمەش خۆشحاڵین بە دیداری جەنابت و هیوای لەش ساغیت بۆ دەکەم، دواتر هەڵساو جامانێکەی لەسەر کرد و ئەوجا بە تەواوەتی مامۆستا مەلا ئەحمەدم ناسییەوە، چونکە بەرێزیان لە گەرەکی ئیسکانی تازە دراوسێی یەکبووین و زۆر هاورێی

باوکم (شێخ مەحمود) بوو، زۆرجار دەمبینی بەیەکەوە لەلای تەنکی ئاوەکەی ئیسکان، لەگەڵ کەسە بە تەمەنەکانی ئەو گەڕەکە دادەنیشتن و قسە و باسی خۆیان دەکرد، شێخ ڕەزا وتەنی لە بیرم دێ یەکێ لەو کەسانە کە لەگەڵ مەلا ئەحمەد دادەنیشت ڕەحمەتی حاجی عەبدوڵڵا بوو ناسراو بە (عەبە تۆراخ).

جا مامۆستای بەڕێز لە بارەی باوك و باپیری بۆمان دواو وتی: بە داخەوە ژیاننامەو شیعرەکانی مەلا ئەحمەدی کۆری باپیرم تێکەڵ بە ژیاننامەی (شێخ ئەحمەدی کۆری سابڵاغی) کراوەو دەبێ نوسەران و ڕۆشنبیران ئاگاداری ئەم بابەتە بن، چونکە ئەمە مێژووەو دەبێ بە ئەمانەتەوە بنووسرێتەوە، ئەوەبوو بەڕێزیان لە بارەی ژیاننامەی مەلا ئەحمەدی کۆری باپیری و حاجی مەلا محەمەد نور زانیاری زۆر گرنگی پێ داین بۆ ماوەی دوو کاتژمێر قسەی بۆ کردین و دواتر بە کورتی ئاماژەی بە ژیاننامەی خۆی کرد.!

جا بۆ کۆکردنەوەی زانیاری زیاتر لەگەڵ کاك سەرکەوت سەردانی دێی ئۆمەر گومبەت و چەن شوێنکی ترمان کرد لە ناوچەی تەقتەق و دەوروبەری و لەگەڵ چاوپێکەوتنی ژمارەیەك لە کەسایەتی و بنەماڵەی شێخ تاهیر شێخ شەریف بیرەسپان و..........هتد.

وەك ئاشکرایە دانیشتوانی ئۆمەر گومبەت بە دەربەندی ناسراون، تیرەی دەربەندیەکان لە دیارترین تیرەکانی پارێزگای هەولێرو دەشتی کۆیەو کەنار زێی بچووکن، کە لە بنەڕەتدا دەربەندیەکان هەموویان ئامۆزاو بنعام و خزم و خوارزای یەکن، لەساڵی ١٧٤٨ز لە ئۆمەرگومبەت نیشتەجێ بوونە.

بەڵام بنەماڵەی مەلا ئەحمەدی کۆر کە لەدێر زەمانەوە نیشتەجێی ئۆمەر گومبەت بوون، خۆیان بە (سەید) دەزانن و دەچنەوە سەر (سەید محەمەد پیرخدری شاهۆ) بۆیە باسەکەمان تایبەتە بە بنەماڵەی (مەلا ئەحمەدی کۆر و نەوەکانی) و لەگەڵ کورتە باسێکی ژیاننامەی زانایانی ئەو ناوچەیە کە باسیان هاتووە لەم کتێبەدا.

نووسین لەسەر بنەماڵەیەکی بەرزو بەڕێزو خزمەتگوزارو سوود بەخشی وەکو بنەماڵەی (مەلا ئەحمەدی کۆر) کارێکی ئاسان نییە کە لە هەموو ڕوویەکەوە خزمەتی خەڵکی دێی ئۆمەر گومبەت و ناوچەی تەقتەق و کۆیەو کەرکوکی کردووە، واتە خزمەتەکەیان سنووردار نەبووە، بەڵام جێی داخە ئەم بنەماڵە نە لەڕابردوو نە لە ئێستادا وەك پێویست مافی خۆی نەدراوەتێ و مێژووی پڕ سەروەری ئەم بنەماڵەیە فەرامۆشکراوە، بنەماڵەی مەلا ئەحمەدی

کۆر بە خوداناسی وپێگەی گرنگی مەلایەتی و پیاوچاکی ناویان دەرکردووە، بۆیە لە بەشێکی ناوچە جیا جیاکانی کوردستانی باشوور بە چاوی خۆشەویستییەوە سەیر دەکران.

ئەمە یەکەمین بەرهەمە کە بە کتێب بە ناوی (مەلا ئەحمەدی کۆر ئەستێرەیەکی درەوشاوەی ئاوایی ئۆمەر گومبەت) دەردەچێت، ئەم کتێبە تایبەتە بە بەشێك لە ژیانی عاریفان و زانایان و ناوداران و ڕۆشنبیرانی بنەماڵەی دەربەندی دەردەکەوێت، لە هەمان کاتدا بایەخێکی زۆر گرنگی هەیە بۆ کەلەپوور بۆ مێژوو بۆ نەتەوەی کورد، هیوادارم ئەم کتێبە ببێتە سەرچاوەیەکی باش و کەلێنێکی پڕەوە کردبێ لە کتێبخانەی کوردی جێی خۆی کردبێتەوە.

لەگەڵ ڕێزو خۆشەویستیم......

**نووسەر**

٢٠١٦ / ٧ / ٢٦

# روونکردنەوەیەکی پێویست

خوێنەری ئازیز: لە بارەی ژیاننامەو شیعرەکانی (مەلا ئەحمەدی کۆر) ی ئۆمەر گومبەتەوە، دەمەوێ ئاماژە بەوە بکەم، کە ئەویش تێکەڵ بوونی ژیاننامە و شیعرەکانی ئەم زاتە خزێنراوەتە نێو ژیاننامە و شیعرەکانی (شێخ ئەحمەدی کۆر) ی موکریانی، بڕوانە: لە کتێبی (دیوان و شەرحی حاڵی شێخ ئەحمەدی کۆری موکریانی) لە نووسینی: عەزیز محەمەد پور (داشبەندی) و پێداچوونەوەی مامۆستا هەژار لە لاپەڕە (٤) دا باس لە شێخ ئەحمەدی کۆری موکریانی دەکات گوایا هاتۆتە کۆیە و لە ژێر چاودێری حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلی زادە بووە، مامۆستای (داشبەندی) ئەم زانیاریەی بە هەڵە تۆمار کردووە، چونکە خۆی باس لە شێخ ئەحمەدی کۆر دەکات کە کەسێکی نەخوێندەوار بووا!

بۆیە ئەو باسە مەلا ئەحمەدی کۆری ئۆمەر گومبەتە کە لەلای حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلی زادە خوێندوویەتی و تەنانەت ژووری تایبەتی خۆی بووە و پەیوەندی لەگەڵ بنەماڵەی مەلا عەبدوڵلا زۆر بەهێز بووە، بەلگە بۆ ئەوەش مەلا محەمەدی جەلی زادە (مەلای گەورە) لە کتێبی تەفسیری کوردی کەلامی خوداوەندی بەرگی سێیەم لاپەڕە (١١ — ٧٨) باس لە پیاوچاکی و خوداناسی مەلا ئەحمەدی کۆری ئۆمەر گومبەت دەکات، بە جۆرێك مەلای گەورە بە (وەلی) ناوی دەهێنێت، هەر لەمبارەیەوە بیرمەند و فەیلەسووفی کورد مامۆستا مەسعود کوڕی مەلا محەمەد جەلی زادە لە کتێبی (حەمەغای گەورە) لاپەڕە (٦٦ — ٦٧) وا باس لە مەلا ئەحمەدی کۆر ئۆمەر گومبەت دەکات: (لە کۆیە پیاوێکی ديندار و خواناس و ڕاستگۆ هەبوو، ئەویش مەلا ئەحمەدی کۆر ئومەر گومبەت بوو، ئەم دینداره یەکێك بوو کە شۆرەتی ڕاستی و ئیمانی بەلای هەموو (کۆیە) وە لە گومان بەدەر بوو.

مەلا ئەحمەد ((مامۆستا کۆرە)) لە مریدەکانی بریفکان بووە و بەینێك لەوێ ئاشەوانیی کردووە، کاك ئەحمەدی شێخ لە هەندێ نامەی کە بۆ حاجی مەلا عەبدوڵلای ناردووە دەنووسێ سەلام لە ئاشەوان دەکەم مەبەستی مەلا ئەحمەدە، باوکم بارەها و جارەها مەجلیسی شەوانەی بە باسی مامۆستا کۆرە ڕادەبوارد و عیشقێکی ئەو کوێرەی لەدڵدا بوو هەرگیز کز نەبووەوە).

پاشان هەر ئەم پەیوەندییە وایکرد کە حاجی مەلا محەمەد نور کوڕی مەلا ئەحمەدی کۆر بچێتە خزمەتی (مەلای گەورە) و لەلای زانستە شەرعییەکان تەواو بکات و لەسەر دەستی ئەو زاتە مۆڵەتی مەلایەتی وەرگرتووە، پاشان لەسەر داوای حەمە ئاغای کۆیە (حاجی مەلا محەمەد نور) بە مەلایەتی چۆتە کۆیەو بۆ ماوەی چەند ساڵێك لەوێ مەلایەتی کردووە، ئەمانە هەمووی بەڵگەن بۆ (داشبەندی) کە بەهیچ شێوەیەك باسەکەی پەیوەندی بە شێخ ئەحمەدی کۆری موکریانیەوە نییە،!

هەڵەیەکی تری مامۆستای داشبەندی لەلاپەڕە (٧) دا دەڵێ: جگە لە ئەحمەدی ئێمە واتە: ئەحمەدی کۆر موکریانی – هیچ مەلا ئەحمەدێکی تر نییە، ئەگەر کەسێك بەو ناوە هەبایە ئەوە بێ گومان حاجی قادری کۆیی باسی لێوە دەکرد، بۆ ئەم قسەیەم مامۆستایان (هەژار و رۆژبەیانی) دا پێیان وایە کە هیچ مەلا ئەحمەدێکی دیکە بەو ناوە نیە، !

منیش دەڵێم: ببورە مامۆستای داشبەندی وادیارە بەرێزت و لەگەڵ هەردوو مامۆستا هەژار و مامۆستا رۆژبەیانی وەك پێویست پیداچوونەوەتان بۆ ئەم باسە نەکردبێت، بۆیە دیسان دەڵێم: لەم باسەدا بە هەڵەیە چوون، چونکە دایکی مەلا ئەحمەدی کۆری نۆمەر گومبەت کە ناوی (دەوڵەت خانم) ە. خوشکی حاجی قادری کۆیی بوو، واتە: دەکاتە خاڵی مەلا ئەحمەدی کۆر، ئەمەش بەڵگەیەکی تر.

هەروەها مامۆستای داشبەندی لەلاپەڕە (٣) دا دەنوسێ: شێخ ئەحمەدی کۆری موکریانی لەساڵی (١٧٧١) لە دایکبوە، لەساڵی (١٨٥٦) لە تەمەنی ٨٥ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە،!

زۆر باشە بابێینە سەر شیعرەکان: مامۆستای داشبەندی لەلاپەڕە (٨١) دا دەڵێ: وەك پێشتر ڕام گەیاند، یەکێك لەم دەسنوسانەی بەلای منەوە هەیەو لەساڵی (١٣٢٣، ١٣٢١، ١٣١١) کۆچی لە شاری کەرکوك نووسراوەتەوە، ئەم پارچە شیعرە (بەهارە) بەناوی ئەحمەدی کۆرەوە تۆمار کراوە، بەردەوام دەبێت و دەڵێ: بەپێ لێ تۆژینەوەی ئێمەوە کە باستان بۆ دەکەین ئەم مێژوولکەی ئاخری دەکەوێتە ئاخرو ئۆخری ژیانی ئەحمەدی کۆر،!

بەرێز مامۆستای داشبەندی دیسان ئەم زانیاریەت هەڵەیە، چونکە لە نووسینەکەی پێشووت دا لاپەڕە (٣) دا ئاماژەت کردووە کە شێخ ئەحمەدی کۆری موکریانی لەساڵی (١٨٥٦) وەفاتی کردووە، کە وابوو ساڵی (١٣١١) کۆچی دەکاتە بەرامبەر ساڵی (١٨٩٣) زایینی، واتە: ٣٧ ساڵ بەسەر کۆچی دوایی شێخ ئەحمەدی کۆر موکریانی تێپەڕیوە.

بەلام مەلا ئەحمەدی کوری ئۆمەر گومبەت لەسالّی (١٨٢٥) لە دایکبوە، لەسالّی (١٩١١) کۆچی دوایی کردووە، ئەمەش بەلگەیە کە ئەم شیعرەو زۆربەی شیعرەکان بۆ مەلا ئەحمەدی کوری ئۆمەر گومبەت دەگەرێتەوە، هەر لەمبارەیەوە لە سەردانێکمدا بۆ لای مامۆستا مەلا ئەحمەد کوڕی حاجی مەلا محەمەد نور کوڕی مەلا ئەحمەدی کۆر، بۆ هەمان مەبەست بەرێزیان هەمان بۆچوونی هەبوو وتی: (ژیاننامەو زۆربەی شیعرەکانی مەلا ئەحمەدی کۆری باپیرم تێکەلّ بە ژیاننامەو شیعرەکانی ئەحمەدی کۆری موکریانی کراوە، بۆیە داواکارم لە نووسەران و رۆشنبیران و مامۆستایانی زانکۆ و کەسانی شارەزا لە بواری ئەدەب و شیعرو مێژوو، لێکۆلینەوەی جددی لەم باسە بکەن بۆ ئەوەی چی ڕاست و دروستە بۆ خوێنەری خۆشەویست بیخەنەڕوو)...

**نووسەر**

٢٠١٦ / ٩ / ١١

# چەن وشەیەك بە یادی مامۆستا
# مەلا ئەحمەدی كۆر و نەوەكانی

گەلێ جا گوێ بیستی شیعرەكانی خوالێخۆشبوو ئەحمەدی كۆر دەبوم، كە زۆرمان پێ خۆشبوو، ئەو كاتە نەمان دەزانی كە ئەحمەدی كۆر یەك كەس نییە، لەوانەیە دوان و سییان بن، بە هەرحاڵ خودا بەر ڕەحمەتیان بكا، ئەم ئەحمەدی كۆرەی ئێمە خەڵكی دێی (ئۆمەر گومبەتی) سەر بە شارۆچكەی كۆیە بوو، پیاوێكی خوێنەوارو ڕۆشنبیرو شاعیرێكی پایەبەرزو وەلییەكی لە خوداترس و پیاوچاك و داناو زانا بوو، سێ زمانی بە چاكی زانیوە، دەڵێن: توركیشی كەمێك دەزانی.

لە دێی ئۆمەر گومبەت مزگەوتی بنیادناوەو لەوێ مەلایەتی كردووە، دانیشتوانی ناوچەی كۆیەو تەقتەق و هەندێ لە كەركوك و سلێمانی و شوێنانی دیكەشدا زۆر ڕێزیان لێ گرتووە، كاك ئەحمەدی شێخ زۆر خۆشەویستی بووەو سەلامی بۆ ناردووە، كاتێ نامەی نووسیوە بۆ كۆیە لە ناوەرۆكی نامەكەدا دەڵێ: سەلام لە ئاشەوان دەكەم، مەبەستی لە مەلا ئەحمەدی كۆر بووە، چونكە نازناوی مەلا ئەحمەدی كۆر لە لای حاجی كاك ئەحمەدی شێخ (ئاشەوان) بوو، ئەم زاتە دۆست و ناسیاو خۆشەویستی بنەماڵەی حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلی زادە ومامۆستا مەلا محەممەدی كۆیە ناسراو بە (مەلای گەورە) باوك و كوڕ، وەگەلێ كەسایەتی ئەو كاتە وەكو: سەید ئەحمەدی خانەقاو سەید سلێمان جلبەسەرو مەلا محەممەدی گۆج و .......هتد.

مەلا ئەحمەد كۆر تەمەسووكی بە شێخ نورەدینی بریفكانی كردووەو لە خزمەتی ئیجازەی تەریقەتی لێ وەرگرتووە، زۆر خوداپەرست و دنیا نەویست بوو، دەگێڕنەوە: لە سەردەمی عوسمانی چەن دێیەكیان پێ بەخشیوە، بەڵام نەی ویستووە،لێیان پرسیوە بۆچی قەبوڵی ناكەی، لە وەڵامدا وتوویەتی: (نامەوێ ڕەنگ دابكوتم لە دنیادا).

زۆر لە ئاغاكانی وڵاتی دزەیی و شێخ بزێنی و سیان و شوان و ساڵەیی و چەند خێڵێكی دیكە، گەلێ جار بۆ دوعای خێر، بۆ پرس و ڕا، بۆ سوڵح و ڕێكەوتن پەنایان بۆ بردووە، واتا: بە هەموو مەعنای كەلیمە ئەم زاتە پیاوێكی ڕۆشنبیرو تێگەیشتوو و خواناس بوو، بۆیە لە باسی ئەم زاتە دەڵێم:

زاتێك بـــوو پیرۆز خوێنەوار بـــوو زۆر
مەشهور بـوو زانـــا خـــۆ ئەحمەدی كۆر
شیعرەكـــانی ئەو زۆر كـــات دەخوێنرێ
لـە مناسەبـــاتا نـــــاوی دەهێنرێ
لە بیری جـوان و وشـەی پـــڕ مەعنا
ئەدرەوشێتەوە نـــــــاو ئەو شیعرانا
مامـۆستا هەرچـەن نـــاو دەبرا بە كۆر
خـاوەن بەهـرە بـوو بەهـرەی جۆراوجۆر
عالیـــم و زانـــا شـــاعیر و دانـــا
مەشهـــور بوو لـــە نـــاوگشت شاعیرانا
شتـــی دەبیـنی بـــــە هێـز دەروونی
لە چـاو ساغ زیـــاتر ئەی دی بەروونی
خــوا بەشی دابـــوو نیعمەت و ڕەحمەت
شتی دەزانـی بە چـــــاو (بە سیرەت)
هـەزاران ڕەحمەت هـــەم لوتفی یەزدان
بۆ سەر ڕۆحی بێ، هـــەم بـــۆ ئەوەكان
هەرچەن زۆری چەشت ئەو لە زەحمەتی
قەبری وا لـــــە دێی ئۆمەر گومبەتی
باغی بە هەشتە ئێستـا ئـــەو گـــۆڕە
زیارتگـــای مـــەلا ئەحمەدی كـــۆرە

دەبێ ئەوەش بڵێم: مەلا ئەحمەدی كۆر سێ كوڕی مەلا بوون، بەم ناوانە: مـەلا نـور محەمـەد، حاجی مەلا محەممەد نور، مەلا عەبدوڵلا.

١- لە بارەی مەلا نور محەممەد، ئەم زاتە هەرچەن مەلا بوو لە هەمان كاتدا كەسێكی سوارچاك و قسـەزان و ئـازاو بـوێر و كوێخـای گونـد بـوو، مـەلای گـەورەی كۆیـە لـە بـارەی زیرەكـی و

لیهاتووی مەلا نور محەممەد دەڵێ: (خودا ڕەحمی کرد کەمت خوێندو ئەوەندە زیرەکی. ئەگەر خوێندنت تەواو کردبا- هیچ بۆ ئێمە نەدەما).

٢- حاجی مەلا محەممەد نور، ئەمیش زاناو عەلامەی سەردەمی خۆی بوو، لە چوار زمان شارەزا بوو، بۆ خوێندن گەڵێ شوێن گەڕاوە، لە ئەنجامدا لە خزمەت مەلا محەممەدی جەلی زادە (مەلای گەورە) زانستە شەرعییەکانی تەواو کردووەو ئیجازەی مەلایەتی لێ وەرگرتووە، وەك ئاماژەم پێدا ئەم زاتە زۆر عالیم بوو، خاوەن کەشف و کەرامەت بوو، خەڵکی تەقتەق و کۆیە و دووگردکان و شوان و بیرەسپان، گەڵێ باس لە پیاوچاکی و کەرامەتی ئەم زاتە دەکەن، لە بارەی دەرمان کاری گژو گیا (طبي شعبي) دەستی باڵای هەبوو، بە جۆرێك لە شیعرەکانی ئەمە بەدی دەکرێ، لە بارەی تەریقەتەوە سالیکێکی ڕاستەقینە بوو، لە خزمەت شێخ عەبدولڕەحمانی بریفکانی ئیجازەی تەریقەتی لێ وەرگرتووەو تا کۆتایی ژیانی پەیرەوی ڕێبازی تەسەوفی کردووە.

٣ مەلا عەبدوڵڵا، مرۆڤێکی عابید و تەقی و سەخی تەبیعەت بوو، مەلای دێی (سماقە) بوو. بە کورتی ئەم سێ کوڕە لە سەر نەهجی باوکیان ڕۆیشتوون، خوای گەورە لە ئێمە و ئەوانیش خۆشبیت.

لە کۆتایی ئەم وشانەم کە بۆ ئەم کتێبە نووسیمەوە دەڵێم: بەڕاستی برای بەڕێز مامۆستا (سیروان سەرگەڵویی) هەوڵی چاکی داوە و ماندوو بووە، بۆ پوختەکردنی کتێبەکەی بەناو نیشانی: (مەلا ئەحمەدی کۆر ئەستێرەیەکی درەوشاوەی ئاوایی ئۆمەر گومبەت)، کە بە وردی لێکۆلینەوەی لەسەر ژیانی مامۆستا مەلا ئەحمەدی کۆرو کوڕەکانی کردووە، دەس خۆشی لێ دەکەم.و بەرهەمەکانی کاکە سیروان هەموو ڕێك و چاك و پاكن، تایبەتی کتێبەکەی (سەید ئەحمەدی خانەقا) کە ئەویش وەکو ئەم کتێبە یەکەم جارە کە چاپ بکرێن بە شێوەیەکی ڕێك، زۆر پێویستە لەسەرمان یادی کەسایەتییە بەڕێزەکانی کورد بکەینەوە، وەبە ئەم بەرتووکەیش هەڵبەتە خشتێك لە دیواری ڕۆشنبیری کورد دەچەسپێ و کەلێنێك لە کتێبخانەی کوردیدا پڕ دەکاتەوە نرخی تایبەتی خۆی دەبێ...

شێخ حوسێن بەرزنجی

١٠ / ١٠ / ٢٠١٦

# گوندی ئۆمەر گومبەت

نووسەر سەعد فاروق لە بارەی گوندی ئۆمەر گومبەت دەنووسێت: دانیشتوانی ئۆمەر گومبەت بنەچەیان دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەی دەربەندی شاهۆی کوردستانی ڕۆژهەلات، باپیرە گەورەیان بە ناوی (جومعە) هاتۆتە دەوروبەری سنوری ئەمڕۆی گوندەکە سەرەتا لە (مەروانی سەرێ) لە نێوان ئاقاری گوندی (ئیلنجاغی گەورە و مەرزان) خۆی گرتۆتەوە و هەر لەو شوێنە لە گۆڕستانی (کانی قەبران) لە مەرزانی سەرێ بەخاك سپێردراوە، کە بە جومعە دەربەندی ناسراو بووە، ئەوانە ئەمڕۆ کە خۆیان بۆ ئەو زاتە دەگەڕێننەوە بە (٨ – ٩) پشت دەژمێرن تا دەگەنەوە جومعە دەربەندی[1]. !

لەمبارەیەوە ئیدریس عەبدوڵلا دەنووسێت: دەربەندییەکان لە دوای مردنی (جومعە دەربەندی) لە هەواری ئۆمەرە کوشیاو نامێنن، ڕوو دەکەنە هەوارێکی تر بەناوی هەواری (بانی قەیتاس) کە ئەویش کەوتۆتە سنوری ئێستای گوندی ئۆمەر گومبەت، لەم هەوارەش ماوەی چوار پێنج ساڵ دەمێننەوە دواتر هەواری بانی قەیتاس بەجێ دەهێڵن و لە دەوروبەری ساڵی (١٧٤٨ز) دێنە شوێنی ئێستای ئۆمەر گومبەت نیشتەجێ دەبن[2].

ئیدریس عەبدوڵلا لەبارەی دەربەندی دەڵێ: تیرەی دەربەندیەکان لە دیارترین تیرەکانی پارێزگای هەولێر و دەشتی کۆیە و کەنار زێی بچووکن، تیرەی دەربەندیەکان بەوە جیا دەکرێنەوە کە پەیوەندی بەهێز لە نێوانیاندا لەگەڵ یەکدی کۆیان دەکاتەوە، بە شێوەیەك کە دەربەندیەکان هەموویان ئامۆزا و بنعام و خزم و خوارزای یەکن، کە لە دوای هاتنی (جومعە دەربەندی) و نەوەکانیەوە لە دوای هێرش و پەلاماری (نادر شا) ی ئەفشار بۆ سەر ناوچەکانی (کرماشان و سەر پێڵی زەهاو – ناوەندەکانی دەرنە)، ئەمانە لەو شەڕەدا تێکشکاون و ناوچەکانی خۆیان بەجێ هێشتووە، لە دوای پەرتەوازە بوون و ئاوارەبوونیان قۆناغ بە قۆناغ تا گەیشتن بەم ناوچەیە و پاشان بۆ یەکجاری لەم سنورە گیرسانەوە، وەك گوندەکانی (ئۆمەر گومبەت، سێگردکان، کێنەلە، گەرمك، مخۆڕەس، شیوەجانی، کانی ڕەش، ناسر و میسر، جگیلە، چەمە زەردەڵە........هتد[3].

---

[1] - بڕوانە: سەعد فاروق شێخ بزێنی. هۆزی شێخ بزێنی. لاپەڕە ١٧٧، ساڵی ٢٠١٥.

[2] – بڕوانە: ئیدریس عەبدوڵلا، لە دەروەندەوە هەتا ئەیرە، مێژوو، لاپەڕە ٧٣، ساڵی ٢٠١٥.

[3] – هەمان سەرچاوە، ئیدریس عەبدوڵلا. لاپەڕە ١٠٤.

ئیدریس عەبدوڵڵا لە درێژەی باسەکەیدا دەڵێ: گوندەکانی (ئۆمەر گومبەت و سێگردکان و کانی لەلەو بەشێك لە سێکانی)، ئەمانە بە شێوەزاری (لوڕی) قسەدەکەن، بە درێژایی مێژوو کە شێوەزارەکەیان پاراستووە، تەنانەت منداڵە بچووکەکانیشیان کە فێری قسەکردن دەبێ لە تەمەنی دووساڵیدا بەم شێوەزارە قسەدەکەن[1].

هەروەها سەعد فاروق دەڵێ: دەربەندی تیرەیەکە سەر بە هۆزی شێخ بزێنی، دەربەندی زۆرینەی گوندەکەیە و ئەوانیتر لە ناویاندا تواونەتەوە، شەلەوەندی کە بەرەبابێکن لە نەوەی (مەلا هاشم) کە لەقەبی (مەلا شەلەیە) بۆیە پێیان دەڵێن شەلەوەندی، ئەم شەلەوەندیانە بەرەبابێکن لە تیرەی دەربەندی کە یەکێکن لە تیرەکانی هۆزی شێخ بزێنی[2].

لە کەسایەتیە ناودارەکانی ئەم گوندە (حاجی فەقێ محەممەدی مەلا ئەحمەدی ڕەشی شەلەوەندی بووەو لە ڕووی خزمەتکردنی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە زۆرترین مەلایان لێ هەڵکەوتووەو مەلا زادە بوون وەك: (مەلا ئەحمەدە ڕەشی شەلەوەندی، مەلا عومەری خانەقای شەلەوەندی، مەلا سدیق شەلەوەندی، مەلا عەبدوڵڵای شەلەوەندی، مەلا حەمەدەمینی شەلەوەندی – باوکی مەلا عەبدوڵڵاو مەلا نوری و مەلا محەممەدی ئۆمەر گومبەتی).

لە مبارەیەوە مامۆستا مەلا مەحمودی شێخ بزێنی بۆی گێڕامەوە وتی: دانیشتوانی ئۆمەر گومبەت بە دەربەندی ناسراون و لە بنچینەدا دەگەڕێنەوە سەر هۆزی شێخ بزێنی[3].

هەر لە باسی ئۆمەر گومبەت نووسەر سەعد فاروق دەڵێ: سەردەمانێك گەورە پیاوی ئەم گوندە (محەممەدی کوڕی حاجی قادر) بووە، کە لەو سەردەمە گوندی ئۆمەر گومبەت لە بیست ماڵ و یازدە جووت پێکهاتبوو، بەڵام بەر لە جەنگی جیهانی یەکەم بریتی بوو لە حەفتا ماڵ و بیست و دوو جووت[4].

ناوی ئەم گوندە لە ناوی (چاکێك) ەوە هاتووە، کە سەعاتە ڕێیەك لە سەرووی خۆرئاوای گوندی ئۆمەر گومبەتەوە دوورە، ئەم چاکە پێی دەوترێت (ئۆمەر گومبەت) تا ئەم دواییانەی

---

1 – هەمان سەرچاوە: ئیدریس عەبدوڵڵا، لاپەڕە ١٠٢، ١٠٣.

2 – سەرچاوەی پێشو: سەعد فاروق، لاپەڕە ١٧٧.

3 – چاوپێکەوتنی: مەلا مەحمود عەزیز شێخ بزێنی، ڕۆژی سێشەممە ڕێکەوتی (٢٧ / ١٢/ ٢٠١٦) خانەقای سەید ئەحمەد – کەرکوك..... نووسەر.

4 – هەمان سەرچاوە: سەعد فاروق، لاپەڕە ٧٢.

سەدەی رابردوو خەڵکی ئۆمەر گومبەت مردوویان لە گۆڕستانەکەی دەوروبەری ئەم مەزارە ناشتووە، بەبێ جیاوازی و بیروڕای جۆراوجۆر هەموو خەڵکی ئۆمەر گومبەت ئەم بیروبۆچونەیان لەسەر ناوی گوندەکەیان هەیە.

ئەم گوندە بە دووری (٦) کیلۆمەتر لە ڕۆژهەڵاتی ناحیەی سێگردکان هەڵکەوتووە، گەورەترین رووبەری لە نێو گوندەکانی ناحیەکەدا هەیە و نزیکەی (٥٠) کیلۆ مەتری چوار گۆشەیە، کە دەکاتە (١٩٩٨٧) نۆزدە هەزار و نۆسەد و هەشتاو حەوت دۆنمی کشتوکاڵی، (٢٥٨٨) دۆنمی شیاوی چاندن و (٧١٨١) دۆنمیشی پاوان و لەوەرگایە، (٩٠٠٠) دۆنمی بەراوە و (٢١٨) دۆنمی حەرەمی گوندە و (٧) کانی و (٢) کارێزی هەیە، زۆربەی زەوی و زارەکانی خاوەندارێتیەکەی بۆ میری دەگەڕێتەوە، جگە لە (١٢٥) دۆنمی نەبێت تایبەتە و خاوەندارێتیەکەی بۆ جوتیارەکان دەگەڕێتەوە، لە ڕۆژهەڵاتدا هاو سنورە لەگەڵ گوندەکانی (گەرمکی تەقتەق و تاڵەبانی گەورە و کانی لەلە)، لە خۆرئاواشدا لەگەڵ گوندەکانی (میرەکە و قەمبەر و نێرەگین و سێگردکان) ئاقاری دەگەڕێتەوە، وە گوندەکانی (ئیلنجاغی گەورە و سماقە) سنوری سەر روویان دەورداوە، لە باشوریشدا ئاقاری گوندی (کانی لەلە) ناهێڵێت هیچ پارچە زەوییەکی ئۆمەر گومبەت بگاتە کەناری زێی بچووك[1].

لە سنوری ئەم گوندە چەندین خرابگەو شوێنەواری تێدایە وەکو: (چاکی ئۆمەر گومبەت، کەلەکین، بالە، قەبرستان، ئەحمەد کلاو، شێ محەمەدی ئەحمەدی کلاو، کاولە هەواری گوندی گۆڕ قەرەجی زێدی حاجی قادری گەورە شاعیری کورد)، هەروەها چەندین گۆڕستان و گۆڕیچکەی کۆن و لە مێژینانەی تێدایە وەکو: ( گۆڕستانی شێخ سمایل کە مردووی لێ دەنێژن، لەگەڵ گۆڕستانی مەلا ئەحمەدی گەورە (شێخ مەلا ئەحمەدی کوێر ئۆمەر گومبەتی) ئەویش مردووی لێ دەنێژن.!

جگە لە گۆڕستان، چەند چاك و شەخسێك لە ئۆمەر گومبەتدا کە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت هەندێك لە خەڵکی زیارەتیان دەکەن وەکو: (چاکی ئۆمەر گومبەت، چاکی وەسمان، ئەسحابەی گۆڕ قەرەج)، چەند کارێز و کانیاوێك لە سنوری ئۆمەر گومبەتدا هەیە وەکو: (زەلین و دارەبی و باپیرە و جەژنی سوێر و ڕێ قری خەزانی و دەرمانـاو) وە چەند گردێك دەوری ئاواییەکەیان داوە وەکو: (لە ڕۆژهەڵاتی گردی ئامینە و گردی مێرخانە و لە ڕۆژئاوا گردی بەردمێرکی و لە باکوردا گردی زالواو، جگە لەمانە لە سنوری گوندەکەدا گردی تریش هەن و

---

[1] - سەرچاوەی پێشوو: سەعد فاروق، ١٧٦.

هەریەکە و ناوێکی هەیە وەکو: گردۆڵکەکانی (گۆرکەکە و کەلی چاوشین و گەرووی زالواو و گەرووی شیلانە و گردەل و قەلاتە سوور و گردی شەمشیرە و گەرووی ئاوازە)، بەلام بەرزترین گردی سنورەکەیان گردی (گۆر تەتە) یە کە سێگردکانیەکان هەندێك ساڵ بۆ گەشتیاری بەکاریان هێناوە[٢].

هەروەها چەند ئەشکەوتێك لە سنورەکەدا هەیە وەکو: (ئەشکەوتی حەمە سمێل و ئەشکەوتی خدر مێرەم و ئەشکەوتی کەلەکین و ئەشکەوتی باپیرە و ئەشکەوتی قورمینگەو جویلەکە)، بەلام تێکرای سنوری نۆمەر گومبەت لە زەوی و بەراو هەژارە و تەنها پارچەیەکی بچووك نەبێت لە خوار شێروەزن لە نزیکی ئاقاری گوندی کانی لەلە.!



**گوندی نۆمەر گومبەت**

٢ – هەمان سەرچاوە: لاپەرە ١٧٧.

## ڕووخاندنی گوندی ئۆمەر گومبەت:

نووسەر سەعد فاروق وا باس لە ڕووخان و کاولکارییەکانی ئۆمەر گومبەت و شۆڕشەکانی کورد دەکات[1]:

١- حکومەتی عێراق لە سەردەمی حەرەس قەومی (پاسەوانی نەتەوەیی یان گاردی نەتەوەیی) لەساڵی ١٩٦٣ بە فرۆکە بۆردمانی گوندی ئۆمەر گومبەتی کردووە.

٢- جارێکی تر لەساڵی ١٩٨٦ فرۆکە مەرگ چێنەکانی ڕژێم بۆردومانی گوندەکەیان کردووە.

٣- جارێکی تر هەلیکۆپتەرە مەرگ چێنەکانی ڕژێم لە (٢٦ / ٨ / ١٩٨٨) بۆردومانی گوندەکەیان کردووە.

٤- دواجار لە پرۆسەی ئەنفالی چوار دا (٣ – ٨) ی ئایاری ١٩٨٨ وەك تێکرای ئاوایییەکانی سنورەکە بە تەواوی وێرانکرا.

## شەهیدانی گوندی ئۆمەر گومبەت:

گوندی ئۆمەر گومبەت وەك هەموو گوندەکانی تری کوردستان لە شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێ و راپەرین چەندین ڕۆڵەی بووە بە قوربانی، کە (١٣) هاوڵاتی جوتیارو ژن و منداڵ و (٢) ئەنفالکراو و (٤) پێشمەرگەی شەهیدی داوە[2].

[1] - سەرچاوەی پێشوو: سەعد فاروق. لاپەرە ١٧٩.
[2] - هەمان سەرچاوە: لاپەرە ١٧٩.

# مزگەوتی ئۆمەر گومبەت

بە پێی گێڕانەوەی دانیشتوانی دێی ئۆمەر گومبەت، لەسەر دەستی مامۆستا مەلا ئەحمەدی کۆر مزگەوتی (ئۆمەر گومبەت) دروستکراوە، ئەمەش لە دەوروبەری ساڵی ١٨٥٠ بووە، ئەم زاتە لە بنەڕەتی پێگەیشتنیا زۆر بەگەرمی کۆششی کردووەو بە پایە گەیشتووە، پاش خوێندنی زانستە شەرعییەکان لە کۆیەو سلێمانی و بیارە، چووە بۆ خزمەت شێخ نورەدین لە بریفکان، ماوەیەك لەوێ دەمێنێتەوەو لە خزمەتی ئەو زاتە سلووکی کردووەو پاشان ئیجازەی لێ وەرگرتووە.

لەمبارەیەوە مەلا ئەحمەد کوڕی حاجی مەلا محەمەد نور بۆی گێڕامەوەو وتی[1]: باپیرم مەلا ئەحمەدی کۆر لە سەر راسپاردەی شێخ نورەدینی بریفکانی هاتۆتە کەرکوك و چۆتە لای (سەید محەمەد) کە مەلای مزگەوتی گڵچێکان بووەو بۆ تاقیکردنەوەی مەلا ئەحمەدی کۆر لە بارەی شەریعەتەوە، لە تاقیکردنەوەکە سەرکەوتوو بووەو پاشان لەسەر ڕاسپاردەی سەید محەمەد دەچێ بۆ خزمەت (حاجی کاك ئەحمەدی شێخ) لە سلێمانی، لە خزمەتی ئەم زاتە بۆ ماوەیەك دەمێنێتەوە، دواجار دەگەڕێتەوە بۆ دێی ئۆمەر گومبەت و یەکەم کەس بووە کە مزگەوتی ئۆمەر گومبەتی بنیادناوەو لە هەمان کاتدا حەوزێکی ئاوی دروستکردووە! لە بارەی تەسەوفەوە سالیکێکی سالارو پیاوێکی دامەزراو و هۆشیار بووە، وە لە ڕێبازی تەریقەتیشدا زۆر بایەخی بە ڕێبازەکەی داوە.

لە ڕێگەی تەریقەتەوە گەلێ خزمەتی ئایینی کردووە، لە ڕێگەی زانست و زانیاری شەرعەوە زۆر تێکۆشاوەو زۆر جار هەر لە بەرگی مەلایانەدا ژیاوە، بەردەوام ئیرشادو ئامۆژگاری موسڵمانانی کردووە، جێی باسە بە دەیان فەقێ و زاناو دانا لە حوجرەی مزگەوتی ئۆمەر گومبەت خوێندوویانەو پێگەیشتوون لەوانە: مەلا ئەحمەدی حاجی ئیبراهیم و حاجی مەلا

---

[1] - چاوپێکەوتنی: مەلا ئەحمەد کوڕی حاجی مەلا محەمەد نور، لە ڕێکەوتی (٩ / ٦ / ٢٠١٦) دارەتوو – هەولێر.......نووسەر.

عومەری گومبەتی و مەلا نور محەمەد و حاجی مەلا محەمەد نورو مەلا عەبدوڵڵاو مەلا مەحمود محەمەد موفتی کۆیەو مەلا محەمەد ماميلی و مەلا عەلی ئۆمەر گومبەت و دەیانی تر لە مەلای بەناوبانگی ئەو سەردەمە لە حوجرەو مزگەوتی ئۆمەر گومبەت خوێندوویانە، کە هەریەك لەم بەرێزانەی ناوبران، بە شارو شارۆچکەو وڵاتدا بڵاوبوونەتەوەو ئیرشادو رێنمایی موسڵمانانیان کردووەو گەلێ سوود بەخش بوون بۆ خەڵکی ناوچەکەو دەوروبەری خۆیان.

لەمبارەیەوە نووسەر ئیدریس عەبدوڵڵا دەنوسێت[1]: لە سنوری قەزای کۆیە چەند گوندێك مەدرەسەو حوجرەی فەقێی تیا بووە، چونکە لەو سەردەمەدا خوێندن تەنیا لە حوجرەی مزگەوتەکان بوو، لانکەی زانست و زانیاری بوون، مەلای چاك و فەقێی زۆریشیان هەبووە لەوانە: دێی (ئۆمەر گومبەت) یش یەکێك بووە لەو دێیانەی لە سنوری کۆیە کە بەردەوام حوجرەی فەقێی هەبووەو (مەلا ئەحمەدی کۆر) دەرسی بە فەقێکان وتووە لەوانە: فەقێ محەمەدی سێکانی و فەقێ عەلی بانەمۆردی و.........هتد.

---

[1] – بڕوانە: دیداری حاجی قادری کۆیی، وەزارەتی رۆشنبیریی و لاوان، لاپەڕە ٩٧، ساڵی ٢٠١٦.

## نۆژەنکردنەوەی مزگەوتی نۆمەر گومبەت:

لــە مــاوەی دامەزرانــدنی ئــەم مزگەوتــەو بــۆ ئــەم ســەردەمەی ئــەمڕۆ چــەند جارێــك نوێژەنکراوەتــەوە و دواجـار لەسـاڵی ١٩٩٤ لەلایـەن خـەڵکی دێـی نۆمـەر گومبـەت مزگەوتەکـە بنیادنراوەتەوە، جێی باسە لە ڕێکەوتی (٢٠ / ٧ / ٢٠١٦) لەگەڵ بـرای بـەڕێزم کـاك سـەرکەوت سەردانی دێـی ناوبراومـان کـرد، کاتـژمێر ١١،٤٥ ی پـێش نیـوەڕۆ چووین بـۆ مزگـەوتی نۆمـەر گومبەت، بینای مزگەوتەکە لە خشت و قوڕ دروستکراوە.

بانەکـەی بـە کۆنکریـت داڕێـژراوە، درێـژیی حـەرەم (١٦) مـەترە، پانیشی (٦) مـەترە، شـەش دینگەی تێدایە کە لە ئاسن دروستکراوە، سێ پەنجـەرەی مـام ناوەنـدو پەنجەرەیـەکی بچووك بوونی هەیە، لەگەڵ دوو ژوورو بەر هەیوانێك کە درێژیی (٨) مەترەو ( ٢) مەتر پانییـەتی و چوار دینگەی ئاسنی لە خۆگرتووە.



مزگەوتی نۆمەر گومبەت

# کورتەیەك لە ژیاننامەی

# مەلا ئەحمەدی کۆر

لە شەودا سەیری ئاسمان بکەیت چەندێ ئەستێرە دیارە، لە بەهاردا لە پانتایی زەوی دەوروبەر بڕوانیت چەندێ گوڵ لە رووکارە، لە بەرامبەر قەدپاڵێکدا لە هاویندا رابوەستیت شنەی شەماڵ چەند بەکارە، لە ئاوی کانییەکی هەڵقوڵاوی ژێر سێبەری دارستانی چیایەکی کوردستاندا ڕابمێنیت چەند سازگارە، لە جیهانی خواپەرستی و سوارچاکی و ئازایەتی و نیشتمانپەروەری و فەلسەفەی بیرو هزری عیرفاندا، ئەوەندە کەس هەڵکەوتوو سازو بەئاکارە. ئەگەر بمانەوێت باس لە پیاوچاکان و خواپەرستان بکەین، پەڕاو نییەو قەڵەم کلۆڵە زمان سواوە و بیرو ئەندێشەش بێ توانایە لە باس و یادی ( مەلا ئەحمەدی کۆر)، چونکە خاوەنی پلەو پایەیەکی کۆمەڵایەتی بەرزو زانیاری و زوهد و وەرع و خۆپارێزی و لە خواترسان بوو.

ناوی تەواوی: شێخ ئەحمەد ناسراو بە (مەلا ئەحمەدی کۆر) کوڕی بابارەسوڵ، ئەم بابارەسوڵە لە نەوەی زانای گەورە (سەید محەمەد شاهۆی پیرخدری[1]) یە، لەمبارەیەوە مامۆستا شێخ عەلائەدین دەنووسیت: شێخ ئەحمەدی کۆر لە نەوەی سەید محەمەد زاهیدە و بە پیرخدری شاهۆ ناسراوە[2]، !

---

[1] - سەید محەمەد کوڕی سەید مەحمود کوڕی سەید جەعفەرە. کە دەگەڕێتەوە سەر ئیمام عەلی ڕەزا کوڕی ئیمام موسای کازم، سەید محەمەد لەبەر دووری لە دنیا بە (زاهید) ناسراوە، یەکەم کەسێکە لە ڕشتەکەدا کە هاتۆتە کوردستان و ناز ناوی پیری لێنراوە، مێژووی هاتنەکەی بەڕوونی دیار نییە، بەڵام بەگوێرەی هەندەێ بەڵگە، وەکو ئەوەی دەڵێن: موریدی شێخ عومەری سەهەرەوەردی بووەو ئەویش لە مێژووی (٦٣٢) ی کۆچیدا لە جیهان دەرچووە، دەبێ مێژووی هاتنی سەید محەمەد زاهید بۆ کوردستان لە دەوروبەری (٦٠٠ تا ٦٤٠) ی کۆچیدا بووبێ، سەید محەمەد بە (پیرخدری) ناوبانگی دەرکردووە، بەداخەوە ساڵی کۆچی دوایی و ماوەی ژیان و بەسەرهتیمان بە شێوەیەکی دڵنیاکەرەوە بۆ ڕوون نەبۆتەوە، ئەوەندە نەبێ زانراوە کە گۆڕی سەید محەمەد زاهید لە دەشتی (زێوە) ی نزیك گوندی (قوتلوئاوا) کە ئێستا پێی دەڵێن (پیر خدران) لەو کاتەوە تا ئەمڕۆ زیارەتگای موسڵمانانە.......بڕوانە: سەیدەکانی کوردستان و ڕۆڵی گرنگیان لە مێژوودا، عەلائەدین سەید ڕەزا سەنگاوی، لاپەڕە ١٥٢، ١٥٣، ساڵی ٢٠١٥.

[2] - هەمان سەرچاوە: لاپەڕە ١٥٦.

ناوبراو لە ساڵی ١٨٢٥ ز لە بنەماڵەیەکی ئایینی لە دێی ئۆمەر گومبەت چاوی بە ژیان هەڵهێناوە، خانەوادەی مەلا ئەحمەد لە کاتی خۆی لە سنووری دەربەندی شاهۆوە هاتوون و لە بناری چیای کانی لە دێی (گۆڕ قەرەج و ئۆمەر گومبەت) نیشتەجێ بوونە، دایکی ناوی (دەوڵەت خان کچی ئەحمەد) [٣] بووە.



لە راستەوە: ئارامگەی دایە دەوڵەت خان – خوشکی شاعیری ناوداری کورد (حاجی قادری کۆیی) و دایکی مەلا ئەحمەدی کۆر

کاك سەرکەوت محەمەد نەجیب لەسەر ئارامگەی باپیرە گەورەی مەلا ئەحمەدی کۆر

---

[٣] – مەلا ئەحمەد بۆی گێڕامەوەو وتی: دەوڵەت خانم کچی مەلا ئەحمەد کوڕی مەلا ساڵح کوڕی مەلا ئەحمەدی گەورەیە. کە دەکاتە خوشکی شاعیری بەناوبانگی کورد (حاجی قادری کۆیی)، دایە دەوڵەت خانم لە ئافرەتە ناسراوەکانی سەردەمی خۆی بووەو مرۆڤێکی خوێندەوارو ئایین پەروەرو خواناس بووە، هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەر بووە. هەروەها قورئانێکی بەدەستی خۆی نووسیووەتەوەو زۆربەی کاتەکانی بە خوێندنی قورئان بەسەر بردووە، لەبەر بەڕێزی وخۆشەویستی بۆ هەمووان بە دایە(دەولەت) ناسراوە......تەواوی ئەم زانیارییەم لە بەڕێز: مەلا ئەحمەد کوڕی حاجی مەلا محەمەد نور، لە ڕێکەوتی (٩ / ٦ / ٢٠١٦) وەرگرتووە...... نووسەر.

مـەلا ئەحمـەد بـۆ خوێنـدن زۆر شـوێن گـەڕاوە لەوانـە: کۆیـە، کـەرکوك، سلێمانی، بریفکـان، شایانی باسە لە گونـدی بریفکـان تەمەسـووکی بـە زانـاو عەلامـە (شـێخ نـورەدین بریفکـان[1]) کردووەو ماوەیەك لەوێ بووە، پاشان ئیجازەی تەریقـەتی لێ وەرگرتـووە، دواجـار دەگەڕێتـەوە بۆ زێدی خۆی و لە دێی نۆمەر گومبەت مەلایەتی کردووە.



**مزگەوت و تەکییەی شێخ نورالدین بریفکانی – لە ناوچەی بادینان**

---

[1] - شـێخ نـورەدین کـوڕی شـێخ عەبدولجـەبار کـوڕی شـێخ نـورەدین کـوڕی شـێخ ئەبوبـەکر کـوڕی شـێخ زەینەلعابدین کوڕی قوتبی زەمان شێخ شەمسەدینە. ناوبڕاو لەساڵی ١٢٠٤ ك- ١٧٨٩ز لە گونـدی (بریفکـان) ی سەر بە پارێزگای دهۆك لـە خانەوادەیـەکی ئایینی لـەدایکبوە، پاش فامکردنـەوە لـە خوێنـدنگای خۆیانـدا خوێندوویەتی و قورئانی پیرۆزی تەواو کردووە، دوای ئەوە بە یاسای قوتابیانی ئەو رۆژە بـە خوێنـدنگاکانی دەوروبەردا گەڕاوە و پەرەی بە خوێندن داوە تا پێگەیشتووە. هەمیشـە دڵـی لەسـەر خوداپەرستی و بەنـدەیی کردنی خودا بووەو حەزی لە تەسەوف بووە. لەسەر ئەو حەزو ئارەزووە چووە بۆ شاری موسڵ و تەمەسـوکی بە حاجی شێخ مەحمودی جەلیلی موسڵی کردووە – کە مورشیدی تەریقەتی (قادری) بووەو سلوکی کردووە تا ئیجازەی وەرگرتووە، پاش ماوەیەك شێخ نور محەمەدی هیندی لە هیندستانەوە هاتووە بۆ کوردستان، جـا شـێخ نـورەدین لای ئـەم زاتـەش کەسـبی تەریقـەتی (نەقشـبەندی) کـردووەو ئیجـازەی ئـەم تەریقەتەیشـی وەرگرتووە، وەکو خۆی دەفەرموێت:

**حەقیقەت قـادریمە، من لـە تەنگـاوا رەفـاعیمە**<br>**لـە زەوقـا سەهـرەوەردیی و غـولامی نەقشبەندیمە**

بەهەر حاڵ شێخ نورەدین یەکێك لە پیاوە گەورەکانی رۆژگارو خاوەنی کوشوفات و کەرامات بووەو لـە هـەمان کاتـدا نوسـەرو ئـەدیب بووەو زۆر شیعری بـە زمـانی عـەرەبی و کـوردی- کرمـانجی سـەروو- هەیـە، وەگـەڵ دانراوی لـە تەسـەوفدا هەیە، لەساڵی ١٢٦٧ك- ١٨٥٠ز کۆچی دوایـی کردووەو لـە تەکیـەی بریفکان بەخاك سـپێردراوە........بڕوانە: مـەلا عەبدولکـەریمی مـودەڕیس. بنەماڵـەی زانیـاران. لاپـەڕە ٤٣٥، ٤٣٦، چاپـی یەکەم، ساڵی ١٩٨٤.

لەمبارەیەوە مامۆستا مەلا ئەحمەد[٢] کوڕی حاجی مەلا محەمەد نور بۆی گێڕامەوە و فەرمووی: پاش تەواو کردنی قۆناغی خوێندن، باپیرم هاتۆتە زێدی خۆی ئومەر گومبەت و مزگەوتێکی بنیادناوە، باپیرم پیاوێکی زاناو خواناس بووە، گەلێ سوود بەخش بووە بۆ مۆسڵمانان، جا بەوهۆیەوە حکومەتی عوسمانی هەشت گوندی پێشکەش بە باپیرم کردووە لەوانە: (گەرمك، تەقتەق، ئۆمەرگومبەت، سێگردکان، ئاومالٚ و .....هتد، بەڵام باپیرم قەبوڵی نەکردووەو لێیان پرسیوە بۆچی قەبوڵی ناکەی، فەرموویەتی: نامەوێ لە دونیادا ڕەگ دابنێم، لەم بارەیەوە شیعرێکی جوانی فەرمووە کە دەڵێ:

ئەحمەدی کۆر بەس خەیاڵکە
حوبی دونیایەت لێ بەتاڵکە
پێکەوە نابێ دوو هەوێیی
یەك بگرەو یەك بەرەڵاکە

[٢] - چاوپێکەوتنی: مەلا ئەحمەد کوڕی حاجی مەلا محەمەد نورکوڕی مەلا ئەحمەدی کۆر، ڕۆژی پێنج شەممە ڕێکەوتی (٩ / ٦ / ٢٠١٦ز) سێیەم ڕۆژی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٤٣٧ ك)، دارەتوو– هەولێر.....نووسەر.

## مەلا ئەحمەدی کۆر لە دیدی مەلای گەورە دا :

زاناو بیرمەندی بەناوبانی کورد مەلا محەممەدی جەلی زادە (مەلای گەورە) لە بارەی زوهدو تەقوای مەلا ئەحمەدی کۆر دەڵێ: مامۆستا (مەلا ئەحمەدی کۆر) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، بە تەعریز (تعریض) ئەیفەرموو: (ئێمە بە عزەت تەرکی دونیامان کرد – ئەمما بە زیلەت تەڵەبی ئەکەین[1])!.

هەروەها لە مەدحی مەلا ئەحمەدی کۆر دەڵێ: مامۆستا (مەلا ئەحمەدی ئۆمەر گومبەتی) زاتێ زۆر گەورە بوو، ئەتوانم بڵێم بە حەق (وەلی[2]) بوو، تەمەنی لە شەرع و تەقوا ڕابوارد، هەندێ ئەشعاری (مەهدی نامە) لەبەر بوو، گەلێ جار ئەوانەی ئەخوێندەوە:

بە حەفتی دی دەجالی شئوم
بەهەشتی دی مەهدی یەقوم
قەت دەرناچێ لەو مودەتێ

وەهەموو جارێ زەلزەلەی دەکەوتە جەسەدی، ڕۆژێ عەرزم کرد مامۆستا! چەند ساڵە ئەو شیعرانەت لەبەرە؟ هەندێ تێفکری کرد وتی: یاربی خوا خێرت بنووسێ ترست لەدڵ بردمەدەر، من پەنجا ساڵ زیاترە ئەوانەم لەبەرە، وەگەلێ پێش وەلادەتی من ئەو (مهدی نامە) داندراوە، خودا دەرەجەی عالی بکا بە بەرەکەتی وی، لە ئێمەش خۆش بێ.

هەروەها لە بارەی مەلا ئەحمەدی کۆر، نەجیبە خانی جەلی زادە[3] دەڵێ: بابم واتە مەلا محەممەدی جەلی زادە (مەلای گەورە) زۆر مەدحی مەلا ئەحمەدی کۆری دەکردو دەیفەرموو مرۆڤێکی بەدین وپاك و بەعزەتی نەفس بوو، زۆربەی ژیانی لە کۆیە بەسەر بردووەو هاموشۆی بریفکان و سلێمانی و بیارەی دەکرد، لە پاشان چۆتە گوندی ئۆمەر گومبەت لەوێ لەساڵی (١٩١٦ز) ئەمری خودای کردووە!

---

[1] – بروانە: مەلای گەورە، تەفسیری کوردی، لە کەلامی خوداوەندی، بەرگی سێیەم، چاپی یەکەم، لاپەرە ١١، ساڵی ٢٠٠٩.

[2] – هەمان سەرچاوە، مەلای گەورە، تەفسیری کوردی، لاپەرە ٧٨.

[3] - بروانە: مێژووی جەلی زادە، نەجیبە خانی جەلی زادە، لاپەرە ١٥٤، ساڵی ٢٠١١.

د.عوسمان دەشتی[٤] دەڵێ: مەلا ئەحمەدی نۆمەر گومبەت کە بە (مەلا ئەحمەدی کوڕ) ناسراوە و زاناو شاعیر و سۆفییەکی ناودار بووە لە سەدەی هەژدەی زایینی لە دایکبوە و لە گوندی نۆمەرگومبەت لەساڵی (١٩١٦ز) وەفاتی کردووە.



مامۆستا مەلا محمد جلی زادە ( مەلای گەورە )

[٤] - بڕوانە: مەلا مەعسومی هەورامی، مەلاو زاناو وڵاتپەروەر، د.عوسمان دەشتی، لاپەڕە ٥٧، ساڵی ٢٠١٥.

## مەلا ئەحمەدی کۆر لە دیدی مامۆستا مەسعود محەمەد دا [1] :



بیرمەنـدو نووسـەری بـەناوبانگی کـورد مامۆسـتا مەسـعود محەمەد وا باس لە مەلا ئەحمەدی کۆر دەکات: ( لـە کـۆیێ دینداریکی بێ فێڵی بێ مانەند هەبووە ناوی مـەلا ئەحمـەد بوو، لەبەر چاوی زەعیفی پێی گوتراوە مامۆستا کۆرە، ئـەم دینـدارە یـەکێك بـوو کـە شۆرەتی ڕاسـتی و ئیمـانی بـەلای هەموو کۆیەوە لە گومان بەدەر بووە.

مـەلا ئەحمـەد ((مامۆسـتا کـۆرە)) لـە مریـدەگانی بریفکـان بووە و بەینێك لەوێ ئاشەوانیی کردووە، کاك ئەحمەدی شێخ لە هەندێ نامەی کە بۆ حـاجی مەلا عەبدوڵلای ناردووە دەنووسێ سەلام لە ئاشەوان دەکەم مەبەستی مـەلا ئەحمـەدە، بـاوکم بارەهـا و جارەهـا مەجلیسـی شـەوانەی بـە باسـی مامۆسـتا کـۆرە ڕادەبوارد و عیشـقێکی ئـەو کـوێرەی لەدڵـدا بـوو هـەرگیز کـز نـەبووەوە، لـە نێـوان ئـەو باسـانەی کـە مامۆسـتا کـۆرەی دەگێڕایەوە ئەوە بـوو کـە ڕۆژێکیـان پرسـیار لـە بـاوکم دەکـا: ئایـا لـە ماڵـەوە هیچـی ئـەوتۆی بیستووە وەها ڕابگەیـەنێ خێزانێکی حەمـە ئاغـا حـەملی هـەبێ؟ دوای پرسـین لـە دایکـم بـە مامۆستا کۆرە دەڵێتەوە کە ئایشەخانی کیژی حاجی ئەسعەد ئاغـا حامیلەیـە، مامۆسـتا دەڵـێ: بە حەمە ئاغا ڕابگەیەنن خەونم دیتووە کوڕێکی دەبـێ نـاوی لێ بنـێ حەمـە زیـاد ناشـبێ لـە ماڵی خۆی بە خێوی بکا، قسەشم زۆر پێیە بەڵام ڕێم نییە دەریان برم.

جا خوێنەر خۆی چۆنی پێ خۆشـە بـا وەهـا لـەو قسانە ڕامێنـێ، بـەڵام مـن بـاییی تۆسـکاڵێك گومانم لە خەون پێشبینییەکەی مامۆستا کۆرە نییـە، چونکە هـەم ڕاسـتگۆ و ڕاسـترۆ بـووە، هـەم قسەکەشـی بـەبێ پێچـوپەنا و چـەرخ و دۆڵاب بـووە، چ مەبەسـتی دنیاییشـی لـە پـەنا خـەونی هەڵبەسـتراودا نەشـاردووەتەوە، مـرۆی ڕاسـتگۆ و ڕاسـترۆش خەبەرەکـەیان بـە ئێمـە گەیاندووە، کە ئـەوانیش مەبەسـتی دنیاییـان لـەو حیکایەتـە وەرنەپێچاوە، لەمـەش بگـەڕێین ئەگەر لەگەڵ خۆماندا بەدی کردووە ئیتر بۆچی گومان لە کابرایەك بکەین کـە هـەموو کـۆیێ لە سەردەمی خۆیدا شایەدی چاکە و ڕاستی و خواناسی و ئیمانداریی بوون.

---

[1] – بڕوانە: مەسعود محەمەد، حەمەغای گەورە، لاپەڕە ٦٦، ٦٧، سالی ٢٠١٠.

دوای مردنی بە دەیان ساڵ پیاوێکی وەکو باوکم بە گەرمایی عیشقەوە باس و خواسی دەگێڕایەوە، بە زاری خۆی دەیگوت ئەو کتو کوێرە ئەگەر ئاوی چاو و لووتیشی کەوتبایە ناو خۆراکی بەردەمم بێزم لێی نەدەکرد، دەیگوت مامۆستا کوێرە (نەحو) ی عەرەبی نەدەزانی، بەڵام چەندێکی بە ئانقەست عیبارەم بە هەڵە بۆ خوێندبێتەوە گوتوومتی تێی ناگەم، هەتا دەچوومە سەر ڕاستییەکەی ئینجا دەیگوت: ئا با بڵێ با مەعناکەت پێ بڵێم.
لێی دەگێڕایەوە کە ڕۆژانی غەیری ڕەمەزان بە ڕۆژوو دەبوو، زۆر جاران لێی دەگەڕام هەتا دەهاتە نزیکی بانگدان، خواردنێکم بۆ ڕادەگرت گورج لێی وەردەگرتم و گوێی نەدەدایە ئەرکی درێژایی شەو و ڕۆژانی و پارووەکەی دەخوارد و ڕۆژووەکەی لە کیس خۆی دەدا و دەیگوت: نەفسەکەم پێی ناخۆشە بیشکێنم بە ڕۆژوو شکاندنەکەم نەفسەکەم دەشکێنمەوە.
باسی مامۆستا کۆرە لێرەدا جێی نابێتەوە، چونکە لە زۆر ڕووەوە دەبێ لێوەی بدوێین و خەریکی لێ تۆژینەوەی بین).

## مەلا ئەحمەدی کۆرو ئەنجومەنی ئەدیبان:

لە کتێبی ئەنجومەنی ئەدیباندا وا باس لە مەلا ئەحمەدی کۆر دەکات[1]: لە ئۆمەر گومبەتی لای (کۆیە) هەشتا ساڵ لە مەوبەر مەلایێ هەبوو ناوی (مەلا ئەحمەدی کۆر) بوو، پیاوێکی زیرەك و شاعیرێکی مەزن بوو، دوو کوڕی هەبوو ناویان (نور محەمەد) و (محەمەد نور) بوو، هەردوو مەلاو دەوڵەمەندو سوارچاك بوون، دەبێ ئەمەش ڕوون بکەینەوە مەلا ئەحمەدی کۆری ئۆمەر گومبەت جیاوازە لەگەڵ ئەحمەدی کۆری سابلاغی.

---

[1] – بڕوانە: ئەنجومەنی ئەدیبان، دانەر– ئەمین فەیزی بەگ، تۆژینەوەی لێژنەی وێژەو کەلەپور، لاپەڕە ٢٥، ساڵی ١٩٨٣، لەچاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کورد، بەغداد.

# مەلا ئەحمەدی کۆر و
# حاجی کاك ئەحمەدی شێخ

ئەم زاتە یەکێ بووە لە پیاوچاکان و شێخێکی خوداناس و زانایەکی بەناوبانگی سەردەمی خۆی بووە، گەلێ کەشف و کەرامەت و کاری لە یاسا بەدەری لێ دەگێڕنەوە، هەروەها پەیوەندی لەگەڵ زانایان و پیاوچاکانی ئەو سەردەمە بەهێز بووە لەوانە: مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە و کاك ئەحمەدی شێخ و مەلا محەمەدی گۆج و سەید ئەحمەدی خانەقا و شێخ سلێمانی جلبەسەر و شێخ نەجم بیرەسپان و...... هتد، مەلا ئەحمەد پەیوەندی پتەوی لەگەڵ کاك ئەحمەدی شێخ هەبووەو زۆر جاریش سەردانی یەکتریان کردووە.

دەگێڕنەوە: جارێکیان کاك ئەحمەدی شێخ دەچێ بۆ ناوچەی قەرەداغ، مەلا ئەحمەدیش بە مەبەستی دیدەنی کاك ئەحمەد لە کەرکوکەوە بە پیادە دەچێ بۆ سلێمانی، لەرێگا لەلای ئاشە کۆنێك (ئاسیاو) نزیك لە سلێمانی لادەدات و پشوویەك دەدا، ئەم ئاسیاوە بۆ ماوەی چەند ساڵێك لە کارکەوتبوو، دەڵێن بە دانیشتنی مەلا ئەحمەد لای ئاشەکە بە ئیرادەی خودا ئاشەکە دەگەڕێ و دەست بە ئیش دەکات، چەند کەسێ لە نزیك ئاسیاوەکە دەبن و بە دیتنی ئیشکردنی ئاسیاوەکە سەرسام دەبن و ئەم هەواڵە سەرسوڕهێنەرە دەگەیەننە کاك ئەحمەدی شێخ، ئەویش یەکسەر فەرموویەتی: ئەوە مەلا ئەحمەدە بابچین بۆ پێشوازی، لەگەڵ ژمارەیەك لە دۆست و موریدەکانی دەچن بۆ لای، کاتێ دەگەنە لای مەلا ئەحمەد تەماشا دەکەن ئاسیاوە لە کارکەوتووەکە کار دەکاو ئەو خەڵکە سەریان سوڕدەمێنێ، کاك ئەحمەدی شێخ[1] پاش هەواڵ پرسین پێی دەڵێ: لە مەلا ئەحمەدی کۆڕەوە بوویت بە (مەلا ئەحمەدی ئاشەوان).

---

[1] - کاك ئەحمەدی شێخ کوڕی شێخ مارفی نۆدێ کوڕی شێخ مستەفا کوڕی شێخ ئەحمەد کوڕی شێخ محەمەد کوڕی شێخ عەلی وەندەرێنە کوڕی شێخ بابارەسوڵی گەورە بەرزنجییە. ئەم زاتە لەساڵی ۱۷۹۳ز لە دایکبوە، لە خزمەتی باوکی سلوکی کردووەو ئادابی زیکرو فکری بە جێهێناوە پاشان لە خزمەتی تەریقەتی (قادری) وەرگرتووە، هەروەها ئیجازەی مەلایەتی بووە. کاك ئەحمەدی شێخ یەکێ بووە لە پیاوچاکان و عیلمی زاهیرو باتنی زانیوەو زانایەکی کەم وێنە بووە لەو سەردەمەو گەلێ سوود بەخش بووە بۆ موسڵمانان و لەساڵی ۱۸۸۷ز لە تەمەنی ۹٤ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووەو لە مزگەوتی گەورەی سلێمانی بەخاك سپێردراوە.......بڕوانە: سیروان سەرگەڵوویی، ساداتی بەرزنجە، ژیاننامەی پیاوچاکان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە ١٠٦. ساڵی ٢٠١٤.

لەمبارەیەوە مەلا ئەحمەد کوڕی حاجی مەلا محەمەد نور بۆی گێڕامەوەو وتی: لە دوای وەفاتی باوکم بە ماوەیەك چوومە خانەقا بۆ لای سەید ئەحمەدی خانەقا، چونکە زۆر هاوڕێ و دۆستی باوکم بوو، لە خزمەتی مامەوە تا چووە ڕەحمەتی خوا لەساڵی ١٩٥٢ز، بە وەفاتی جەنابی سەید ئەحمەدی خانەقا زۆر دڵگران بووم چونکە ئەو لە جێی باوکم بوو.

پاش ساڵێك چوومە داریکەلی بۆ خزمەت (شێخ مەحمودی حەفید) [1]، چونکە باپیرم مەلا ئەحمەدی کۆر زۆر دۆستی کاك ئەحمەدی شێخ بوو، ئێوارە بوو گەیشتمە داریکەلی، ئەو شەوە لە ماڵێك مامەوە، بۆ بەیانی چوومە مزگەوتی دێیەکە و لەگەڵ مەلای مزگەوت قسەم کردو پێم وت دەمەوێ بچم بۆ خزمەت شێخ مەحمود، مەلا وتی: ئیشت بە شێخ چییە ؟ منیش وتم باپیری دۆستی باپیرم بووە، ئیدی مەلای دێ ناردی بە دوای یەکێ لە پاسەوانی شێخ، مەلا ئەحمەد لە درێژەی باسەکەیدا دەڵێ: زۆری پێ نەچوو یەکێ لە پاسەوانی شێخ هات وتی: چ

---

[1] - شێخ مەحمودی حەفید (مەلیکی کوردستان) ئەم زاتە میللەتی کوردی بە عالەم ناساندو ئاڵای حکومەتی کوردی هەڵکرد، ناوی تەواوی: شێخ مەحمود کوڕی شەهید شێخ سەعید کوڕی شێخ محەمەدی بچکۆل کوڕی حاجی (کاك ئەحمەدی شێخ)ە، ناوبراو لەساڵی ١٨٨١ز لە بنەماڵەیەکی زانست و ڕۆشنبیری و ئایینی لە دایکبوە، لە خانەدانی خۆیان پەروەردە بووەو لە تەمەنی ١٩ ساڵیدا لەسەر خواستی سوڵتان عەبدولحەمید لە خزمەتی شێخ سەعیدی باوکیدا دەچێتە شاری ئەستانە لە تورکیا، لەوێ ڕوتبەی پێدەدرێ، لەساڵی ١٩١٥ز بە هێزێکی دوو هەزار کەسییەوە بەرەنگاری هێزی داگیرکەری ئینگلیزدەبێتەوە، لە کوت و شوعەیبە شەڕێکی قارەمانانە دەکەن، لە (١٨ / ٦ / ١٩١٩ز) لە شەڕێکی بێ وێنەدا لە دەربەندی بازیان بریندار دەبێت و لە تەنیشت (بەردە قارەمان) دا بە دیل دەگیرێت، کاتێك بە دیل گیرا فەرمانی کوشتنی لەلایەن دادگای ئینگلیزەوە بۆ دەردەچێ، بەڵام لە ترسی جەماوەری تووڕە نەیاتوانیی فەرمانەکە جێبەجێ بکەن، بۆیە حوکمەکەی بۆ کرا بە (١٠) ساڵ بەندی و (١٠) هەزار ڕوپیە جەزاو دوور خستنەوەی بۆ هیندستان، تا ساڵی ١٩٢٣ز لەوشارە ژیانی بەسەر بردووە، لە هەمان ساڵدا گەڕایەوە و توانی شاری سلێمانی لە دەستی داگیرکەری ئینگلیز ڕزگار بکات و ئیعلانی حکومەتی کوردستان بکات، لە ڕێکەوتی (١٠ / ١٠ / ١٩٢٢ز) ئەنجومەنی وەزیرانی دروستکرد، شێخ مەحمود هەتا ساڵی ١٩٣١ز لەناو شەڕو ئاژاوەدا بووە لەگەڵ ئینگلیزو هاوپەیمانەکانی، لە کۆتایی ساڵی ١٩٣١ز لەگەڵ حکومەتی بەغدا ڕێکەوت کە لە شاری بەغدا بمێنێتەوە، بۆ ماوەی دە ساڵ لە گەڕەکی ئەعزەمییە مایەوە، لە کۆتایی ساڵی١٩٤١ز گەڕایەوە بۆ کوردستان و لە گوندی داری کەلی جێگر بوو، لە ڕێکەوتی (٩ / ٦ / ١٩٥٦ز) بە نەخۆشی لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کردووەو پاشان تەرمەکە دەهێننەوە بۆ سلێمانی و لە تەنیشت (کاك ئەحمەدی شێخ) دا بەخاکی دەسپێرن، هەزاران ڕەحمەت و سۆزی خودای گەورە بڕژێت بەسەر ئەو و هاوێنەکانی ئەودا............بڕوانە: سەیدەکانی کوردستان و ڕۆڵی گرنگیان لە مێژوودا، عەلادین سەید ڕەزا محەمەد سەنگاوی، لاپەڕە ١٤٧، ساڵی ٢٠١٥.

کارت بە شێخ هەیە، منیش وتم دەمەوێ بچم بۆ زیارەتی، کابرای پاسەوان ڕێگری لێم کردو وتی: ناتوانی چاوت بە شێخ بکەوێ.! لە وەڵامدا وتم باشە ئەم نامەیەم بەرە بۆ جەنابی شێخ کە تێیدا ئەم شیعرەم بۆ نووسی:...

غەریب و بێ نەوام بۆ زیارەت هاتووم قوربان
ئەسیری چەرخی گەردوونم دەخالەت شاهی کوردان
بەرو زەردی لە قاپیت وەستاوە دڵ نەی جان
بە چاوی مەرحەمەت لوتفێ کە قەدری لازمە میهمان

بچووکت- کاك ئەحمەد نەوەی مەلا ئەحمەدی کۆر

پاسەوان نامەکە دەبات بۆ شێخ مەحمود، شێخیش پاش خوێندنەوەی نامەکە فەرموویەتی بانگی بکەن دوای هەواڵ پرسین شێخ دەفەرموێ: کوڕم نەوەی کام مەلا ئەحمەدی؟ سابلاغی یا دەربەندی؟ منیش وتم قوربان دەربەندی! ئەی کوڕم پێت شەرم بوو بڵێت کوڕەزای (مەلا ئەحمەدی ئاشەوانم)، باپیرتان لەلای ئێمە وا ناسراوە، جا فەرمووی: ئێوە سەیدن پیرخدرین و لە نەوەی (پیرخدری شاهۆن)، پاشان فەرموی: هەفتەیە لام بمێنەوە، منیش عەرزم کرد قوربان ئیش و کارم هەیە ناتوانم، فەرموی: هەر دەبێ لام بمێنیتەوە، منیش دوو شەو دوو ڕۆژ لە خزمەتی مامەوەو دواتر گەڕامەوە بۆ کەرکوك و چوومەوە بۆ دێی قوتان چونکە لەوێ مەلای ئەو دێیە بووم کە شێخ سەعیدی قوتان[1] سەرپەرشتی دەکرد لەو سەردەمە.!

---

[1] – شێخ سەعید کوڕی شێخ ئەحمەدی مەڵحە کوڕی شێخ محەمەدی کوڕی حاجی شێخ ئەحمەدی سەردار بەرزنجییە، لەساڵی ١٨٩٧ز لە گوندی (سەرگەڵو) ی سەر بەناوچەی سورداش لە بنەماڵەیەکی ئایینی و نیشتمان پەروەر لە دایکبوە، ئەم زاتە یەکێکە لە کەسایەتیە ناسراوەکانی شاری کەرکوك کە لە سەردەمانێکی دیاریی نێوان ساڵانی (١٩٢٠ – ١٩٥٨) ڕۆڵی کاریگەری هەبوو لە خزمەتکردنی جۆراوجۆر بە دانیشتوانی شاری کەرکوك و دەورووبەری، خاوەن دیوەخان بووە و مەجلیسی هەمیشە جمەی هاتووە لە کەسایەتی کوردو تورکمان و مەسیحی و عەرەب و زانایانی ئایینی و ئەدیب و شاعیرانی کەرکوك و کوردستان. هەروەها هەژارو لێقەوماو بەردەوام ڕوویان لە دیوەخانەکەی کردووە. هەر کەسێك پەنای بۆ بردبێ پارستویەتی و یارمەتی داوە. بە دەیان خەڵکی لە کۆمپانیای نەوتی کەرکوك دامەزراندووە بە بێ جیاوازی. بۆ ماوەی چەند ساڵێك لە گوندی (قوتان) نیشتەجێ بووە، بۆیە ناز ناوی قوتانی وەرگرتووە. لەساڵی ١٩٧١ز لە شاری کەرکوك کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی (تەپە) بە خاك سپێردراوە...بڕوانە: سیروان سەرگەڵوویی. خانەقای سەید ئەحمەد لە ئامێزی مێژوودا، لاپەڕە ٢٤١، ساڵی ٢٠١٥.

کاك ئەحمەدی شێخ لە سەفەرێکیدا بۆ ماڵی خوا بۆ بەجێهێنانی مەناسکی حەج و دوای گەڕانەوەی لەو سەفەرە جببەیەك بە دیاری بۆ مەلا ئەحمەدی کۆر هێناوەو پێی فەرمووە ئەم دیارییەم بۆت هێناوە ئەتان پارێزێ لە هەموو بەڵایەك (دوعای گوللەبەندم) بەسەردا خوێندووە، جا وا مەشهوورە دوعای کاك ئەحمەدی شێخ زۆر گیراو بووەو تەنانەت شێخ مەحمودی حەفید زۆر جار لە کاتی شەڕدا بە کاری هێناوە، مەلا ئەحمەدیش بە سوپاسەوە جببەکەی لێ وەرگرتبوو، پاش وەفاتی مەلا ئەحمەدی کۆر، ئیدی جببەکە وەك تەبەڕوك دابەش کراوە بەسەر نەوەکانی مەلا ئەحمەد دا.

لەمبارەیەوە برای بەڕێزم کاك سەرکەوت کە یەکێکە لە نەوەکانی مەلا ئەحمەدی کۆر بۆی گێڕامەوەو وتی: پارچەیەك لە قوماشی ئەو جببەیە لەلام پارێزراوەو لە چەندین بەڵا ڕزگاری کردووم یەکێ لەوانە: لە ڕێکەوتی (١٣ / ٦ / ١٩٨٧ز) لوغمێکم پیا تەقییەوە لەبەر چاوی دوو هێز ١- (هێزی پێشمەرگەی کوردستان) ٢- (هێزی ڕژێمی کورد کوژی بەغدا) کە لەمبەری جادەوە بۆ ئەو بەری جادە بە ئاسماندا فڕێیداوم، سوپاس بۆ خوا زۆر سەلامەت دەرچووم، ئەمە باشترین بەڵگەیە کە لە خۆم تاقی کراوەتەوە، ئەمەش هیمەت و کەرامەتی حاجی کاك ئەحمەدی شێخە کە خوای گەورە هێزو توانای وای پێ بەخشیوە.



شێخ مەحمودی حەفید
(مەلیکی کوردستان)

# کەرامەتەکانی مەلا ئەحمەدی کۆر

لە بارەی کەرامەتەوە، زانای پایەدار مامۆستا سەید محەمەد شێخانی دەنووسێت[1]: لێرەدا پرسیارێك سەر هەڵدەدات، ئەویش ئەوەیە کەرامەت چی یە؟ ئایا هەموو کەسێك، یاخود هەموو پیاوێکی ئایینی توانای کەرامەتی هەیە؟

لەوەڵامدا دەڵێین کەرامەت بۆ ئەولیا هاتووەو بەشی ئەولیایەکانە، هەروەکو — موعجیزەش (معجزە) بەشی پێغەمبەرەکانە، چونکە ئەگەر ئێمە بڕوامان بە موعجیزەی پێغەمبەران نەبێت، بڕوامان لەمە دەبێت بەرامبەر بە ئەولیایەکان، چونکە زۆر فەرموودەو ئایەت هەیە بۆ چەسپاندنی ئەم ڕاستییە، وەکو خودای گەورە دەفەرموێ: ﴿ الا إن اولياء الله لاخوف عليهم ولاهم يحزنون﴾.

وە پێغەمبەریش (درووودو سەلامی خوای لێ بێت) دەفەرموێ: ((كرامة الاولياء حق))، بێگومان بەڵگەی تریش هەیە دەربارەی کەرامەتی ئەولیاکان، مامۆستا (مەلا ئەحمەدی کۆر)یش زاتێك بووە لە ئەولیاکان و کەرامەتەکانیش لە هەندێك کتێب باسکراوە بە تایبەتی: تەفسیری کوردی، لە کەلامی خوداوەندی، کە مەلا محەمەدی جەلی زادە (مەلای گەورە) نووسیویەتی!

لە مبارەیەوە د. مەلا جەمال محەمەد باجەلان وا باس لە مەلا ئەحمەدی کۆر دەکات: شێخ مەلا ئەحمەد وەلی و پیاوچاك بوو، دانیشتوانی دەڤەری تەقتەق و کۆیەو بەستی شەرغە زۆر لە کەرامەتەکانی دەگێڕنەوە، ئەم زاتە لەسەر دەستی شێخ نورەدین بریفکانی پێگەیشتووە[2].

پاش ئەوەی تەریقەتی سۆفییەتی لە شێخی ناوبراو وەرگرتووە، مەلا ئەحمەدی کۆر لە شەیدای خواپەرستی و سۆفیگەری تووشی (فنا في الله) وەك دەبینی خۆ لە فکر چۆتەوە،

---

[1] - بڕوانە: پوختەیەك دەربارەی هۆزی شێخانی بەرزنجی، لە نووسینی: محەمەد سەید عەبدولکەریم شێخانی بەرزنجی، لاپەڕە ١٩، ساڵی ١٩٨٨.

[2] - بڕوانە: ڕۆژنامەی تاك، ژمارە ١١، لاپەڕە ٥، ساڵی ٢٠٠٥.

ئینجا یەك لەو شتانەی لێی دەگێڕنەوە سواری قەمیشێك بووە لەناو بازاڕی کۆیە ڕای کردووە وتویەتی[٢]:

حەیـــران وەرە لـــە بادینیْ
چـــاوەکی کۆرە یەکیْ نادینیْ
دەست لـــۆ هـــەنـــاران دەبا
هــــە نجیـــران دەپسێنیْ




ئەشکەوتی شێرومزمن – شوێنی خواپەرستی مەلا ئەحمەدی کۆر. جێی باسە ئەو دار خورمایەی بەدەستی خۆی چاندووە، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پتر لە ١٥٠ ساڵ

٢– بڕوانە: ڕۆژنامەی تاك. ژمارە ١٨، لاپەڕە ٦، ساڵی ٢٠٠٦.

## مەلا ئەحمەدی کۆر و مەلا محەمەدی گۆج:

خوالێخۆشبوو مەلا ئیسماعیل[1] گێڕایەوە: مەلا ئەحمەدی کۆر دۆستێکی نزیکی مەلا محەمەدی گۆج[2] بوو، (خوایان لێ رازی بێت)، لە وەرزێکی هاویندا ئێوارانێك مەلا ئەحمەد بە سەردانێك دەچێت بۆ لای مەلا محەمەدی گۆج لە دێی شێخەیی و چیا چەرمی لە ناوچەی شێخ بزێنی خواروو، خەڵکی ئەو دێیە لەسەر کارو خەرمان دەبن، کاتێ خەڵکی دێ بەمە دەزانن، بۆ شەو دەچنە لای مەلا ئەحمەدی کۆرو بە خێرهاتنی لێ دەکەن و تا نیوە شەو لە خزمەتیدا بوونە، دوای نوێژی بەیانی خەڵکی دێ دەچنە سەر کارەکانیان تەماشا دەکەن کارەکانی دوێنێ تەواوکراوە وەك خەرمانی پوشیان هەموو بۆ کوتراوە، گەنم و جۆ بەجیا کۆمەڵ کراوە (کا) بە جیا کۆمەڵ کراوە، سەریان لەو کارە سوڕ دەمێنێ، کە ئەو هەموو کارەیان بۆ جێبەجێ کراوەو ئەمەش لە بەرەکەتی مەلا ئەحمەدی کۆر بووە بۆ دانیشتوانی دێی ناوبراو.

---

[1] - مەلا ئیسماعیل کوڕی مەلا سەعید کوڕی مەلا شەریف کوڕی مەلا محەمەدی گۆجە، ئەم مەلا محەمەدە زۆر دۆستی مەلا ئەحمەدی کۆر بووە، لە ڕێکەوتی (١٩ / ٢ / ٢٠١١) کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی وەکاشە لە نزیك ئارامگای حاجی مەلا محەمەد نور بەخاك سپێردراوە.......سەردانی مەیدانی لەگەڵ کاك سەرکەوت لە ڕێکەوتی (٢٠ / ٧ / ٢٠١٦) کاتژمێر ٣٠، ٦ ئێوارە.....نووسەر.

[2] - مەلا محەمەد دەستێکی تەواو نابێت، بۆیە بە (مەلا محەمەدی گۆج) ناوبانگی دەرکردووە، لە گوندی (شێخەیی و چیاچەرمی) سەر بە ناوچەی شێخ بزێنی خواروو ڕۆژهەڵاتی پردێ مەلا بووە.

## مەلا ئەحمەدی کۆر و حەمە ئاغای شەوگێر:

هەروەها مەلا ئیسماعیل گێڕایەوەو وتی: حەمە ئاغای شەوگێر[1] داوا لە مەلا ئەحمەد دەکات میوانداریيەکی بکات، مەلا ئەحمەدیش داواکەی جێبەجێ دەکات و دەچێ بۆ لای ئاغا، ئەم سەردانەی لە وەرزی زستاندا بووە، بۆ ماوەی چەند ڕۆژێ لەوێ دەمێنێتەوە، جا خەڵکی سنوری شێخ بزێنی خواروو شوان و ساڵەیی بە نیازی دیدەنی و سوود وەرگرتن لە ڕێنمایی و ئامۆژگاریيەکانی سەردانی مەلا ئەحمەدی کۆر دەکەن، ڕۆژێك مەلا ئەحمەد بە ئاغا دەڵێ: دەبێ بۆ بەیانی بگەڕێمەوە بۆ ئۆمەر گومبەت، جا بۆ ئەو شەوە وا ڕێك دەکەوێ بارانێکی بەخوور دەبارێت و ئاوێکی زۆر بەلافاو بەزێیەکەدا دێت هیچ کەڵە کەوانێك ناوێرێ لێی بپەڕێتەوە، دوای نانی بەیانی حەمە ئاغا و چەند کەسێکی تری دێی ناوبراو لە خزمەتی دا چووبوون بۆ بە ڕێکردنی، کەڵە کەوانەکان کاتێ تەماشای زێیەکە دەکەن ئاوێکی زۆر هاتووە خۆیان خلافاندووە نەیانوێراوە لە ئاوەکە بدەن، مەلا ئەحمەدیش کاتێ بەمەی زانیوە هیچ خۆی سڵ نەکردووەو بەناوی دەستنوێژەوە خۆی لێیان دوردەکاتەوەو دوای ماوەیەکی کەم بینیویانە پەڕیوەتەوە ئەوبەری زێیەکەوە، مەلا ئەحمەد بەرماڵەکەی قەد دەکات و دەڵێ: حەمە ئاغا ئەزیەت مەکێشن من وا پەریمەوە خوا ئاگادارتان بێت.!

دەگێڕنەوە: مەلا ئەحمەدی کۆر یەکێ لە سیفەتەکانی ئەوە بوو کە لە وەرزی زستاندا دەرگەی ماڵەکەی دەخستە سەرپشت، کاتێ ڕۆژ دەبۆوە بە دەیان ئاژەڵی کێوی جۆراوجۆر لە ترسی سەرماو بەفر بارین خۆیان بە حەوشەی ماڵەکەی کردووە، بۆ ماوەیەك لەوێ دەمێننەوەو لەلایەن مەلا ئەحمەد خزمەت کراون و خۆراك و ئالیکیان پێ دراوە.

---

[1] – شەوگێر گوندێکە سەربە ناوچەی شێخ بزێنی خواروو لەسەر زێی بچووك...سەربە شارۆچکەی (شوان)ە.

## مەلا ئەحمەدی کۆر و گوندی عەلی بەیان:

شێخ بورهان چورداخی[1] لە زاری باوکی بۆی گێڕامەوەو وتی: مەلا ئەحمەدی کۆر زۆر دۆستی باپیرم بوو شێخ نەجم، باپیرم پیاوێکی ئایین پەروەر و چاو لە دنیا نەبووە، زۆریش حەزی لە شیعر و پیاوی شاعیر و بەدینی خۆش ویستووە، جارێکیان مەلا ئەحمەد لە ڕێی هاتنی بۆ بیرەسپیان، دەگاتە گوندی (عەلی بەیان) لەو کاتەدا بانگی نوێژی نیوەڕۆ دەبێت، مامۆستا مەلا ئەحمەد بەرەو مزگەوت دەڕوا، بەڵام بە شێوەیەکی زۆر سەیر.واتە: ڕاست ناڕوا پێچ دەکاتەوە ئاراستەی ڕۆشتنەکەی دەگۆڕێ، جا پێش مزگەوتەکە شوێن خەرمان بووە، واتە زەویەکی تەخت دەبێت، کە چی مەلا ئەحمەد لەو ڕێگە ڕاستە لادەدات و بە ڕێگایەکی تردا دەڕواو تا دەگاتە لای مزگەوت، خەڵکی لای مزگەوت لە چاوەڕوانی دەبن، مەلا ئەحمەد سڵاویان لێ دەکات، ئەوانیش زۆر بە گەرمی پێشوازی لێ دەکەن، دواتر خەڵکی ئاوایی لێی دەپرسن مامۆستا بۆچی ئاراستەی ڕێگاگەت گۆڕی؟

لە وەڵامدا پێیان دەڵێ: ئێوە نابینن بڵێسەی ئاگری غەزەب لەو گۆڕەپانە بەرزدەبێتەوە! ئەوانیش دەڵێن ڕاستە چەند ڕۆژێ لەمەوبەر شایی و ڕەشبەڵەکی لێ کراوە، واتە: (شایی تێکەڵاوی ژن و پیاو)، بەڵێ مامۆستا مەلا ئەحمەد شاعیرێکی تێکەڵ بە خۆشەویستی ئایین و پێغەمبەر بووە، واتە: (وەلی) بووە، چونکە زۆر شتی لێ دەگێڕنەوەو تەنانەت لە منداڵیمەوە[2] تا ئەم سەردەمە شیعرێکی مامۆستا (مەلا ئەحمەدی کۆر) م لەبەرە کە دەڵێ: *

---

[1] - چاوپێکەوتنی: شێخ بورهان ناسراو بە (شێخ بورهان چورداخی) لە ڕێکەوتی (٣٠ / ٦ / ٢٠١٦) کەرکوک......نووسەر.

[2] - بورهان چورداخی لە بیرەوەری خۆیدا ئەمەی نووسیوەو دەڵێ: من بەمناڵی لە پۆلی پێنجی سەرەتایی بووم، ئەم شیعرە لە پیاوێکم وەرگرت بەناوی مام حەمەدەمین دارەمانی کە ناسراو بوو بە (حەمەدەمین کیلۆ).

* - تێبینی: نووسەر ئیدریس عەبدوڵڵا ئۆمەر گومبەتی: لە کتێبی دیداری حاجی قادری کۆیی، لاپەڕە ٩٩، ساڵی ٢٠١٦، ئەم شیعرەی پشت ڕاست کردۆتەوەو دەڵێ: بۆ یەکەم جارە ئەم هەڵبەستەی مەلا ئەحمەدی کۆر بڵاودەکرێتەوە،! جێی باسە پێشتر ئەم شیعرە لە دیوانی شێخ ئەحمەدی کۆری موکریانی لە نوسینی: عەزیز محەمەد پور(داشبەندی) دا لاپەڕە ٢٠٠ - ٢٠١ بڵاو بۆتەوە، هەروەها لە دیوانی ئەحمەدی کۆرلە نووسینی: سەید نەجمەدینی ئەنیسی لاپەڕە ١١٣ - ١١٤ چاپی یەکەم ١٣٧١ هەتاوی بڵاوکراوەتەوە،! بەڵام ئەوەی جێی تێڕامانە بنەماڵەی (مەلا ئەحمەدی کۆر) ی ئۆمەر گومبەت پێیان وایە ئەم شیعرە و زۆربەی شیعرەکانی مەلا ئەحمەدی کۆری ئۆمەر گومبەت تێکەڵ بە شیعرەکانی مەلا ئەحمەدی کۆری موکریانی کراوە.......نووسەر.

دڵبەرا دائـم دەنـاڵـم، دەم بـە دەم شـام و سەحەر
جارێ نا پرسی لـە حاڵم، چـاو عوقابی خۆش خەبەر
چـاو عوقابی مەه جەمـاڵی، دوژمنی کوفرو ضەلالی
نـوری سیرِی لایـزالـی کـاشفی شق القمـر

کـاشفی قمـر دونیـمی شـافیعی یـوم الالیمی
فا تحی دەرگـای نەعیمی، انت لي نـور البصـر
تۆی بینایی هـەردوو چـاوم، بە فیدات بێ جسم و نـاوم
هەڵگێراوە خـورد و خـاوم، خـواردنـم بۆتە زەهر

خواردنم بـۆتـە زوخـاوە، سەبـرو هـۆشم لێ بڕاوە
ئـاتەشی دڵ وا بـەتـاوە، مثلی شەمعی نێو فەنـەر
وەك فەنـەر دڵ پـڕ لـە نـارم، باری عصیان بۆتە بارم
ڕووسیاهـو شەرمـەزارم، مـن لـەبەر یـوم الخطـر

من لـەبەر یـوم المـاتم، دێ کە قـابض بـۆ حەیـاتم
وا بەدڵ خـەجیل و مـاتم، نـامێنێ هـۆش و خـەبـەر
نامێنێ هـۆش لـەو سەعاتێ، کـە دەفتەری دنیام دەداتێ
ڕوح گەیـیە جێگەی نەهـاتێ، نـامێنێ مەیلی پسـەر

نامێنێ مەیلی ژیـانـم، دێتە جـونبـوش ڕوح و گیانـم
یارەب نەبەسترێ زوبـانـم، نـاوی حـەق بێنم بەزار
نـاوی حـەق بێنـم بـەزارە، دڵ هـەمیشە ئنتیزارە
ئامـادەی کـۆچ و کـۆچبـارە، تـویشوم کـەمـە بۆ سەفەر

* * *

## مەلا ئەحمەدی کۆر و شاڵی سەوز:

مامۆستا (مەلا سدیق گەرمك[1]) باوکی مەلا سدیق[2]، واتە: مەلا ساڵح دەبێتە هاوزاوای مامۆستا (مەلا ئەحمەدی کوێر) خوایان لێ رازی بێت، کاتێ لە ژیاندا بووە ئەم باسەی گێڕاوەتەوە: کە چەند پیاوێکی نورانی لە وڵاتی ئێرانەوە هاتبوون بۆ دیدەنی مەلا ئەحمەد، پاش دانشتن و هەواڵ پرسین، بە مەلا ئەحمەد دەڵێن: کوا شاڵ و سەوزی پشتت؟ لە وەڵامدا مەلا ئەحمەد فە رموویەتی: مرۆڤی خواناس و ڕاستگۆ و دینداری ڕاستەقینە، پێویستی بە شاڵ و سەوز بەستن نیە، خودای تەعالە تەماشای دەروون و کردەوەی بەندەکانی دەکات، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەری نازدار هاتووەو دەفەرمووێ: (انما الاعمال بالنیات).

هەروەها لێی دەگێڕنەوە: کە مەلا ئەحمەدی کوێر زۆر بایەخی بە شەجەرە (شجرە) نەداوە، خەریکی خواپەرستی خۆی بووەو پشتی لە خۆشی دنیا کردووە، بۆیە بە دەستی خۆی شەجەرەی بنەماڵەی سادات کە تایبەت بووە بە ڕەچەڵکی باب و باپیرانی، دەسووتێنێت و وتوویەتی: بۆ ئەوەی نەوەکانی دوای خۆم لە خۆبایی نەبن و خۆیانی پێ بانەدەن، جا مەلا ئەحمەد زۆربەی ژیانی خۆی لە ناو هۆزی دەربەندی بەسەر بردووەو بەردەوام ڕێنمایی موسڵمانانی کردووە  تا لە جیهان دەرچووە.

---

[1] - تێبینی: گەرمك دێیەکە سەر بە ناوچەی کۆیە، دانیشتوانی دێی ناوبراو لە هۆزی دەربەندین، هەروەها دێیەکی تر هەیە بە ناوی گەرمك لە ناوچەی دووز، دانیشتوانی ئەم دێیە خۆیان بە سەید دەزانن و لە نەوەی (سەید مەحمودی کوڕی سەید محەمەد پیر خدری) شاهۆن........نووسەر.

[2] - ناوی تەواوی: مەلا سدیق کوڕی مەلا ساڵحی گەرمکی کوڕی مەلا ئیسماعیل کوڕی ئەوڵڵا کوڕی عەزیزەو لە هۆزی دەربەندییە، ناوبراو لەساڵی ١٩٠٠ لە بنەماڵەیەکی ئایینی چاوی بەژیان هەڵهێناوە، یەکێ بووە لە زانا ناسراوەکانی سەردەمی خۆی، لە تەمەنی ٧ساڵیدا خراوەتە بەر خوێندن لە حوجرەکانی سنوری دەشتی کۆیە، پاشان لە خزمەت مەلا محەمەدی جەلی زادە (مەلای گەورە) ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، پێش نوێژوو وتاری خوێنی مزگەوتی تەقتەق بووە، لەساڵی ٢٠٠٣ لە تەمەنی ١٠٣ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووەو لە شارۆچکەی تەقتەق بەخاك سپێردراوە........بڕوانە: د. عوسمان دەشتی، مەلا مەعسومی هەورامی، مەلاو زاناو وڵاتپەرەر، لاپەڕە ٥٧ ساڵی ٢٠١٥، هەروەها بگەڕێوە:.... ئیدریس عەبدوڵڵا ئۆمەر گومەتی، لە دەروەندەوە هەتا ئەیرە، لاپەڕە ١٨٧، ساڵی ٢٠١٥.

## مەلا ئەحمەدی کۆر و سەید سلێمان جلبەسەر:

سەید عەبدولکەریم کوڕەزای سەید سلێمان جلبەسەر[1] گێڕاویەوە: مەلا ئەحمەدی کۆر جارێکیان میوانی سەید سلێمان دەبێت، لەو کاتەدا نوێنەری میری (نوێنەری مەڕانەی دەوڵەتی عوسمانی) بۆ وەرگرتنی باج داوا لە دانیشتوانی گوند وماڵی سەید سلێمان دەکات کە باجی ساڵانە بدەن، ئەوانیش پارەیان بەدەستەوە نابێت و داوا دەکەن کە باجەکانیان بۆ بخەملێنن، خۆیان پارەکەیان بۆ دێنن، بەڵام نوێنەری میری ڕازی نابێت و دەڵێ: شتی وانیە هەر ئێستا ئامادەی بکەن، جا سەید سلێمان پەنا بۆ مەلا ئەحمەدی کۆر دەباو ئاگاداری دەکاتەوە کە لە مزگەوت دەبێت و مەلا ئەحمەد دێت و بە نوێنەری میری دەڵێ: بەڵکو یارمەتی ماڵی سەید بدەن پیاوی چاکن، ڕاستە ئێستا پارەیان بە دەستەوە نیە، نوێنەری مەڕانە بەو پەڕی لووت بەرزییەوە بەگژ مەلا ئەحمەد دا دەچێت و پێی دەڵێت: (ها کۆرە کەس نەما تۆیان هێناوە بۆ ڕجا)، خەڵکی گوند بەقسەکانی نوێنەری مەڕانە بەرامبەر بە مەلا ئەحمەد زۆر دلگران دەبن، بەڵام مەلا ئەحمەد خۆی سڵ ناکات و بە نوێنەری مەڕانە دەڵێ: پەشیمان دەبیتەوە و بەرەو مزگەوت دەڕوات، نوێنەرەکە وتبووی بڕۆ کۆرە بڕۆ، کەمیکی پێ دەچێ نوێنەری مەڕانە سکی دەپەنمێ (پڕ دەبێت لە با) ئازاری لێ پەیدادەبێت و دەست دەکات (بە تڕ) لێدان و هاوارکردن، لەبەر چاوی خەڵکی گوندی جلبەسەر دەبێتە گاڵتەجاڕی ئەو خەڵکە، پاشان دانیشتوانی گوند پێی دەڵێن: بڕۆ داوای لێ بوردن بکە، ئەویش دەچێت بۆ مزگەوت و خۆی دەدات بەسەر پێڵاوەکانی مەلا ئەحمەد، نوێنەری مەڕانە لێی دەپاڕێتەوە و دەڵێ: لەم تڕ و ئازارە ڕزگارم بکە باج لەسەر ئەم گوندە هەڵدەگرم، مەلا ئەحمەدیش بەزەیی پیا دێتەوەو پێی دەڵێ: (لە خۆبایی مەبە و ڕێزی گەورە و بچووکی بزانە)، پاڵی دەکاو دەست بەسکی دەهێنێت و هەرچی باوو بژێ هەیە هەمووی لەسکی دێتەدەرو دەحەسێتەوە، جا نوێنەری مەڕانە ڕاست دەبێتەوەو دەستی ماچ دەکاو داوای لێ بوردنی لێ دەکاو گوند بەجێ دەهێڵێت و گوندیش لە پێدانی باج ڕزگاری دەبێت.

---

[1] – گوندی جلبەسەر دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەڵاتی شارۆچکەی (پردێ) ی سەر بە پارێزگای هەولێرە.

## مەلا ئەحمەدی کۆر و ئاغای شێخ بزێنی:

کاکە حەمەی مامەشێخ[1] وتی: مەلا سەید عەبدولڕەحمان بۆی گێڕامەوەو وتی: مەلا ئەحمەدی کۆرو سەید محەمەد باوکی مەلا سەید عەبدولڕەحمان و شێخ مەحمود باپیری سەید حەسەن و سەید فازل بە میوانی دەچن بۆ ناو شێخ بزێنی لەوێ بۆ نانی ئێوارە لە ماڵی ئاغا میوان دەبن، کاتێ خواردنی ئێوارە ئامادە دەبێ، ئاغا بە مەلا ئەحمەدی کۆر و میوانەکانی تر دەڵێ: فەرموون بۆ سەر نان خواردن!

مەلا ئەحمەدیش تەماشای ئەو نان و خواردنە دەکات بە ئاغا دەڵێ: ئاغا ئەم نان و خواردنە هی خۆتە؟ لە وەڵامدا ئاغا پێی دەڵێ: بەڵێ هی خۆمە، مەلا ئەحمەد دەزانێ ڕاست ناکەو پێی دەڵێ: کەواتە ئاغا پشت کە، ئاغاش پیشت لەسفرەی خواردنەکە دەکات و بۆ ماوەیەکی کەم، ئەوجا مەلا ئەحمەد پێی دەڵێ: ئاوڕ بدەرەوە، کاتێ ئاغا تەماشای خواردنەکە دەکات دەبینێ هەمووی بووە بە خوێن و زووخاو، ئاغا زۆر شەرم دەیگرێ و بێ دەنگ دەبێ.

مەلا ئەحمەد پێی دەڵێ: تۆ چۆن ئەم خواردنە دەرخواردی ئێمە دەکەی، ئەمە ماڵی فەقیرو هەژارو جووتیارە، لە خوا بترسە، جارێکی تر ئەم کارە دووبارە نەکەیتەوە، پاشان دەبنە میوانی ماڵێکی تر.

---

[1] – چاوپێکەوتنی: شێخ سەدرەدین ناسراو بە کاکە حەمەی مامە شێخ. بنەسڵاوە – هەولێر لە ڕێکەوتی (٩ / ٦ / ٢٠١٦)......نووسەر.

## مەلا ئەحمەدی کوێر و کابرای ڕاوچی:

دەگێڕنەوە: مەلا ئەحمەدی کوێر زۆربەی ژیانی لە دەشت و دەرو چیاکانی ناوچەی تەقتەق و کۆیە بەسەر بردووە، خەریکی خواپەرستی بووەو دێوانە نسبەت گوزەرانی کردووە، بە جۆرێك وای لێ هاتووە گیانەوەری کێوی سڵییان لێ نەکردووە.

لەمبارەیەوە مەلا سەید عەبدولڕەحمان[1] گێڕایەوەو وتی: پیاوێکی ڕاوچی بە ناوی (ئەحمەد) خەڵکی دێی تاڵەبانی سەر بە شارۆچکەی تەقتەق بوو، ڕۆژانە دەچێ بۆ ڕاو، ڕۆژێکیان لە کاتی گەڕان بە دوای ئاژەڵی کێویدا ئاسکێك دەبینێ و تەقەی لێ دەکاو خۆی دەکات بەشیوێکدا ڕاوچیەکە بە دوای ئاسکەکە دەڕوا، بەڵام نایدۆزێتەوە، لە ناکاوە گوێی لە دەنگێ دەبێ بانگی دەکا، ئەویش کە تەماشا دەکا دەبینێ کەسێك لە بن کەورە شاخێك دانیشتووەو ژمارەیەك ئاژەڵی کێوی لە دەوروبەری کۆبۆتەوە، کاتێ لێی نزیك دەبێتەوە دەیناسێتەوە کە مەلا ئەحمەدە و خێرا ئاژەڵەکان لێی دووردەکەونەوە.

جا ڕاوچیەکە بە دیتنی مەلا ئەحمەد زۆر شەرمە زار دەبێ، مەلا ئەحمەد پێی دەڵێ: بۆچی تەقەت لەو ئاسکە کرد ئەی نازانی ئەو ئاسکە بەچکەی هەیە؟ کابرای ڕاوچی وتی: قوربان بۆ بەخێوکردنی ماڵ و منداڵ کاسبیەکی ترم نییە، پێی دەڵێ: ئەگەر ئیشێکت دەستکەوێ واز لە ڕاو دێنی؟ ڕاوچی بەڵێ! جا مەلا ئەحمەد پێی دەڵێ: دەی تفەنگەکەتم بدەرێ، کابرای ڕاوچی ئەیداتە دەستی، مەلا ئەحمەدیش فوو دەکات بەلوولەی تفەنگەکەداو لولەکەی هەڵدەمزرێ و ئیدی لە کار دەکەوێت، پاشان پێی دەڵێ: ئیتر ڕاودەکەی؟ کابرای ڕاوچی دەڵێ تازە ناتوانم ڕاوبکەم، جا ڕاوچییەکە توورەکەیەکی پێ دەبێ، مەلا ئەحمەد پێی دەڵێ: ئەو تورەکە چی تێدایە هەڵیڕێژە، ڕاوچی دەڵێ هەندێ وردەنانی تێدایە و توورەکەکەی هەڵڕشتبوو.

پاشان پێی وتووە نیوەی بکە لەو خۆڵە سوورە، دوعای بەسەر دەخوێنێ و بەئیرادەی خوا ئەو خۆڵە سوورە دەبێ بە ئاردێکی سپیی و جوان، بە کابرای ڕاوچی دەڵێ: ئەم ئاردە دەبەیتەوە بۆ ماڵەوەو دەیکەیتە کەندوەکەتانەوە بانی دەدەن، هەر جارێك نانتان لێ کرد (بسم الله) بکەن بەشی پێنج ساڵتان دەکات و سەری هەڵنەدەنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ پارەی وردەی

---

[1] – مەلا سەید عەبدولڕەحمان لە بنەڕەتا خەڵکی گوندی (عەلی بەیان) ی سەر بە شارۆچکەی (شوان) ە، ئێستا لە بنەسڵاوە – هەولێر ژیان بەسەر دەبات......نووسەر.

دەداتێ و پێی دەڵێ: بەم پارمیە ئەگەر کاسبی پێوە بکەی بە حەڵاڵی و غەدرو فێڵ نەکەی و حەرام نەخۆی باش دەوڵەمەند دەبیت!

کابرای ڕاوچی فەرمایشتی مەلا ئەحمەدی کۆر جێبەجێ دەکات و ئاردو پارەکە دەباتەوە بۆ ماڵەوە، پاش ماوەیەك بەوپارمیە کاری کردووەو باش دەوڵەمەند بووە، ئاردەکەش بۆ ماوەی چوار ساڵ و نیو بە کاری دێنن.

لە کۆتایدا ژنی کابرای ڕاوچی ئارامی لێ هەڵدەگیرێ قسەی پیاوەکەی پێشێل دەکات و دەیەوێت بزانێ نهێنی ئەو ئاردە چییەو بۆچی تەواو نابێت! لە ئەنجامدا سەری کەندوەکە هەڵدەداتەوە کاتێ تەماشای ناو کەندوەکە دەکات هیچی تیا نیە! ئەم ڕووداوە بۆ پیاوەکەی دەگێڕێتەوە، کابرای ڕاوچیش لێی تووڕە دەبێت و دەڵێ ماوەی چوار ساڵ و نیوە کێشەی ئاردو گەنمان نەبووە، چی وەڵامی مامۆستا مەلا ئەحمەد بدەمەوە.

## مەلا ئەحمەدی كۆر و شێخ غەفور بیرەسپان:

شێخ بورهان چوارداخی[1] لە زاری باوكی بۆی گێڕامەوە و وتی: مەلا ئەحمەدی كۆر پیاوێكی ئایین پەروەرو شاعیرێكی هەست ناسك و حەق گۆ بوو، خاوەن بەش لەلایەن خوای گەورەوە، بۆیە ئەوەندە خەمی دنیای نەبووە.

زۆر هاتووچۆی ئاواییەكەی ئێمە (بیرەسپانی گەورە)، (میراصفهان) كردووە، دەگێڕنەوە: كە شێخ غەفور پیاوێكی خاوەن تەكیە و بە ویقار بووە، لە بەردەم تەكیەكەی دێت و دەچێ و دار حەیزەرانێكی بەدەستەوە دەبێ، پێڵاوێكی چاكی ئەو دەمەی لەپێی دەبێ كە پێیان وتووە (گلاس) ی، كەواو سەڵتەی شەعریەی لەبەر دەبێ، جا بە دار عەساكەی لە نووكی پێڵاوەكەی دەدات و لە بەردەم مەجلیس دا دێت و دەچێ، شێخ غەفور هەر چەندە پیاوێكی نان دەر بووە، ئەوەندەش زاڵم بووە، كەس ناوێرێ بڵێ یاشێخ بۆ ئەمڕۆ میزاجت تەواو نیە.

مەلا ئەحمەدی كۆر، كە بەو شێوەیە جەنابی شێخ دەبینێ دلگران دەبێ، روو دەكاتە شێخ غەفورو پێی دەڵێ: (تۆ خۆت بەچی دەزانی وا لە بەردەم ئەم مەجلیسە دێت و دەچی و دار لە پێڵاو ئەدەی و لووتت لە حەوا) كردووە، شێخ غەفور بزەیەك دەیگرێ و دەڵێ: مامۆستا مەلا ئەحمەد چما نازانی من كێم؟. مەلا ئەحمەد یەكسەر لە وەڵامدا دەفەرموێ: (وەی گیف) دەزانم تۆ چیت، تۆ حەمباڵی گویت، جا باوكی رەحمەتیم فەرمووی: مامم شێخ غەفور نەختێ داماو وتی: بەڵێ مامۆستا ڕاستە داوای عەفو دەكەم.

---

[1] - چاوپێكەوتنی: شێخ بورهان شێخ رەئوف بیرەسپان، لە رێكەوتی (٣٠ / ٦ / ٢٠١٧) شەوی هەینی، قاوەخانەی ئەفەندی – كەركوك، ناوبراو لەساڵی (١٩٥٦) لە دایكبوە، شاعیرێكی لێهاتووەو بە دەیان شیعری هەیە.......نووسەر.

# مەلا ئەحمەدی كوێر و شاری كەركوك

دانیشتوانی دێی ئۆمەر گومبەت بە (دەربەندی) ناسراون، لە كاتی خۆی خەڵكی دێی ناوبراو لە شاری كەركوك و لە گەڕەكی زێوێ مزگەوتێكیان بنیادناوە، كە لەو سەردەمە بە (تەكیەو مزگەوتی دەربەندی) بە ناوبانگ بووە، پاشان بە خانەقای حاجی مەلا عومەری گومبەتی ناوبانگی دەركردووە، جا مەلا ئەحمەدی كوێر بە مەلایەتی هاتۆتە كەركوك و لە مزگەوتی دەربەندی پێشنوێژی و ئامۆژگاری موسڵمانانی كردووەو ناوبانگی بە گەڕەك و شاردا بڵاو بۆتەوە.

جا هەندێ خەڵكی ناحەزو دوو ڕوو بۆ گێڕانی ئاژاوە دەچنە لای شێخ عەلی گەورە[1]، پێی دەڵێن قوربان بە بێ ئەوەی ئێمە ئاگادار بكەنەوە، دەربەندییەكان مزگەوت و تەكیەیان دروست كردووەو كەسێكی لێیە بە ناوی مەلا ئەحمەد پێشنوێژی و ئامۆژگاری خەڵكی دەكات، ئیدی بە هەر شێوەیەك بێت وا لە شێخ عەلی دەكەن كەسێك دەنێرێت بۆ تەكیەی دەربەندی، نوێنەری شێخ عەلی بە مەلا ئەحمەدی كوێر دەڵێ: شێخ داواتان دەكات و بێن بۆلای ئێمە؟

مەلا ئەحمەدیش دەزانێ ئەمانە ناحەزو ئاژاوەگێڕن پێیان دەڵێ: ئەگەر شێخ ئیشی بە ئێمە هەیە دەتوانێت خۆی بێت بۆلامان من ئیشم بە شێخ نییە! نوێنەری شێخ عەلی دەگەڕێتەوە، پاش ئەمە شێخ عەلی نامەیەك بە فارسی بە هۆنراوە دەنووسێ:

---

[1] – شێخ عەلی كوڕی شێخ عەبدولڕەحمان خاڵس كوڕی شێخ ئەحمەد كوڕی مەلا مەحمودی زەنگنەیە، ناوبراو لەساڵی ١٨٣٢ز لە دایكبوە، سەرەتا لای باوكی خوێندوویەتی. دواتر چۆتە كۆیەو لای مەلا ئەسعەدی جەلیزادە پەرەی بە خوێندن داوەو لە خزمەتی ئیجازەی مەلایەتی لێ وەرگرتووە، ماوەیەك لە مزگەوتی بلاغ لای مەلا سەید محەمەد بەرزنجی لەگەڵ شێخ عومەری كوڕی شێخ عوسمانی سیراجەدینی تەوێلە پێكەوە خوێندوویانە، هەر لە تەمەنی لاویدا خەریكی ڕێبازی تەسەوف بووەو لە خزمەتی باوكی ئادابی زیكرو فیكری بە جێهێناوەو تەریقەتی (قادری) لێ وەرگرتووە، لە ژێر چاودێری باوكی گەیشتووەتە پلەی خیلافەت، بۆیە باوكی كاتێ كۆچی دوایی كردووە، زانایەكی شارەزاو مورشیدێكی بە توانا بووە، حاجی شێخ عەلی جگە لەوەی زانایەكی گەورەی باڵا بووە لە زانیاری فیقەو شەریعەتدا، هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەر بووە. لەگەڵ بەشی هەرە زۆری فەرموودەكانی پێغەمبەر. لە لێكدانەوەی قورئانیشدا دەستێكی باڵای هەبووە، هەروەها ئەدیبێكی بەرزو شاعیرێكی باڵادەست بووە، لەساڵی ١٩١١ز لە شاری كەركوك كۆچی دوایی كردووەو لە تەكیە بەخاك سپێردراوە، جێی باسە ناوبراو لە هەورامان بە شێخ عەلی موحەدیسی كەركوكی بەناوبانگە، لە كەركوك بە شێخ عەلی گەورە ناسراوە......... بڕوانە: مجلە كركوك الیوم، لاپەڕە ٨٢ – ٨٣ ژمارە ٢٧ سالی ٢٠١٦.

**من ( على ) يەم على حــرف جــر است**

**حـــرف جر قــابـــل نيست جر نكوند**

واتە: من عەليم عەلا حەرفى جەڕە، حەرفى جەڕ قابيل نييە جەڕ نەكات

جا مەلا ئەحمەديش بەم شێوەيە وەڵامى داوەتەوە:

**من ( احمــــد ) م ( لاينصــــرف ) م**

**حــرف جـر بــــا سر من جر نكوند**

بە كوردى:

**من ئەحمەدم گــــەردان نـاكــرێم**

**حەرفى جەڕ لەسەر من جەڕ نەكات**

واتە: من نارۆم و پيتى جەڕ لەسەر من پيادە ناكرێت.

جا هەر بە نوێنەرەكەى شێخ عەلى ئەم نامەيەى بۆ دەنێرێتەوە و ئيتر بێ دەنگ دەبن.!

# کۆچی دوایی مەلا ئەحمەدی کۆر

ئەم زاتە بە درێژایی تەمەنی خۆی خزمەتێکی زۆر بە دانیشتوانی ناوچەی کۆیەو تەقتەق و ئۆمەر گومبەت و ناوچەی شوان و شێخ بزێنی و کەرکوك کردووە، بەردەوام لە خزمەتی ئایین و خاك و کۆمەڵانی کوردەواری بووە، هەمیشە ئیرشادو ئامۆژگاری موسڵمانانی کردووە تا لەساڵی (١٣٣٠ کۆچی – ١٩١١ زاینی)[1] لە زێدی خۆی لە جیهان دەرچووە و لە گۆڕستانێك کە بەناوی خۆیەتی لە دێی ئۆمەر گومبەت بەخاك سپێردراوە.

ئەم پیاوە مەزنە دوو ژنی هەبووە، یەکەم: ناوی (خەدیجە کچی مەلا مەحمود) ە، کە خەڵکی شارۆچکەی کۆیە بووە، لەم ژنە چوار کوڕو کچێکی بووە بەناوەکانی: (نوری ناسراو بە مەلا نور محەمەد، محەمەد ناسراو بە حاجی مەلا محەمەد نور، مەلا عەبدوڵلا، عەبدولڕەحمان، مریەم خان). دووەم ژنی: ناوی (خەدیجە کچی بەکر ئاغای ئەمین ئاغای حەوێزی) کۆیە، لەم ژنە کوڕێکی لێ بووە بەناوی: (حەمە غەریب).



نووسەر لەسەر ئارامگەی مەلا ئەحمەدی کۆر

گوندی (ئۆمەر گومبەت)

---

[1] - تێبینی : د.عوسمان دەشتی دەڵێ: مەلا ئەحمەدی ئۆمەر گومبەت کە بە (مەلا ئەحمەدی کۆر) ناسراوە لە سەدەی هەژدەی زایینی لە دایکبووە و لە گوندی ئۆمەرگومبەت لەساڵی (١٩١٦ز) وەفاتی کردووە... بڕوانە مەلا مەعسومی هەورامی، مەلا و زانا و وڵات پەروەر لاپەڕە ٥٧ ساڵی ٢٠١٥، بەڵام ئەوەی دروستە مەلا ئەحمەدی کۆر لە ساڵی ١٣٣٠ کۆچی ماڵئاوایی لە دنیا کردووە، کە دەکاتە بەرامبەر بە ساڵی ١٩١١ ی زاینی ... نووسەر.

# پوختەیەك لە ژیاننامەی شاعیر
# حاجی قادری کۆیی

هەرچەند دەربارەی ئەم کەڵە پیاوە، ئەم مرۆڤە مەزنە، ئەم شاعیرە هەلکەوتووە بدوێت هەر کەمە، جگە لەوەی شاعیرێکی دیاری ناوچەی کۆیە بووە، لەگەڵ ئەمەشدا پەیوەندی بە باسەکەمانەوە هەیە، چونکە ئەم زاتە خاڵی (مەلا ئەحمەدی کۆر) ە، بۆیە بە پێویستم زانی پوختەیەك لە ژیاننامە و رۆڵی حاجی قادر بنووسمەوە.
شاعیرمان ناوی تەواوی: قادر کوڕی مەلا ئەحمەد کوڕی مەلا ساڵح کوڕی مەلا ئەحمەدی گەورەیە، دایکی ناوی: (فاتم کچی حاجی مەلا ئیبراهیم) ە، بە فاتێ ناسراوە.
وەك شاعیر لە بەیتە شیعرێکیدا ئەم ڕاستیەمان پێ دەڵێ:

**باوکم ئەحمەد بوو ناوی فیکرم دێ**
**خەڵقی لادێ بوو، دایکی من فاتێ**

**له دەقی دەستنووسی مەلا سالْحی مەلا عومەری گومبەتی دا هاتووە:**

حاجی قادر لە ساڵی ١٨١٥ز لە بنەماڵەیەکی مەلا زادەی دەربەندی لە دێی (گۆڕ قەرەج [1]) ی سەر بە شارۆچکەی کۆیە چاوی بە ژیان هەڵهێناوە، سەرەتا لەلای باوکی قورئانی پیرۆزی خوێندووە.

شاعیر لە تەمەنی (٩) ساڵیدا باوکی کۆچی دوایی کردووە، لە دوای وەفاتی باوکی، دایکی بۆ ئەوەی منداڵەکەی لە خوێندن بێ بەش نەبێت لەگەڵ خۆی حاجی دەبات بۆ شاری کۆیە و دەچێتە لای (مەلا ئەحمەدی ئۆمەر گومبەتی برازای) کە دەکاتە کوڕی حاجی مەلا ئیبراهیم کوڕی مەلا هاشم کوڕی مەلا نورەدین، لەو کاتەدا ئەم مەلا ئەحمەدە لە شاری کۆیە مەلای مزگەوتی (موفتی) بووە.

پاش ماوەیەکی کەم (فاتم) ی دایکی حاجی لە کۆیە دەمرێ، بە مردنی دایکی حاجی هیچ ترسکایەکی بۆ ژیان نامێنێ و هەموو خولیاو ئاواتەکەی ڕوو لە کزی دەچن، لە دوای مردنی دایکی (حاجی مەلا ئەحمەد برازای) لە هەمان کاتدا دەکاتە خاڵۆزای حاجی قادر، بڕیار دەدات هەموو مەسرەفێکی بگرێتە ئەستۆی خۆی تا تەواو کردنی خوێندن، لەگەڵ ئەوەشدا کە حاجی قادر بە خۆی سێ پارچە زەوی لە باوکییەوە بۆی بەجێ مابوو بەم ناوانە: (قرقاجین، هاوینە، هەوار، زولفقار)، حاجی هەموو ساڵێك ساڵانەی (خێرو بێری) ئەم زەویانەی وەردەگرت بۆ بژێوی ژیانی.

شاعیرمان ناز ناوی شیعری (حاجی) بۆ خۆی هەڵبژاردووە، هەر چەندە حەجی نەکردووە، بەڵام حاجی قادر کاتێ لە دایکبووە لە مانگی حاجی واتە (مانگی قوربان) بووە، کە مەلا ئەحمەدی باوکی چووە بۆ حەج، تا گەڕاوەتەوە قادری کوڕی لە دایکبووە، بۆیە لەبەر

---

[1] – گۆڕ قەرەج: گوندێکە بە دووری (٩) میلێك کەوتۆتە باشوری ڕۆژئاوای شاری کۆیەوەو ئێستە وێرانەیە، ئەم گوندە لە بنچینەو ڕەچەڵەك دەچنەوە سەر تیرەی (دەربەندی)، کە لە زەمانێکی زۆر لە مەوپێش لە (دەربەندی زەهاو) ەوە بە هۆی هۆکاری کۆمەڵایەتی و سیاسی لە سەردەمی نادر شا لەساڵی ١٧٣١ز بە دواوە هاتوون بۆ ئەم ناوچەیە، ئەمانە ئێستا لە دەوروبەری کۆیە چوار گوند پێك دەهێنن ئەوانیش: (سێکانی، سێگردکان، ئۆمەر گومەت، کانی لەلە)، تەنانەت دانیشتوانی ئەم دێهاتانە ئێستەش بەم شێوەیە قسەدەکەن و شێوەزارو زمانەکەیان پاراستوە، کە شێوەی قسەکردنیان دەچێتەوە سەر شێوەی (دەربەندی زەهاو)......بڕوانە: ئیدریس عەبدوڵلا، دیداری حاجی قادری کۆیی، لاپەڕە ٩٠، ٩١، سلێمانی ٢٠١٦.

خۆشەویستی بە حاجی ناویان بردووە، کە دواتر وەك ناز ناوی شیعری بەکاری هێناوەو لە شیعرەکانی ئەمە بەدی دەکرێ.

لە دوای چەند ساڵ لە خوێندن لە شاری کۆیە، لە هاوینی ساڵی (١٢٧٠ك – ١٨٥٣ز) دا حاجی قادری شاعیر لەگەڵ حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە پێکەوە بە فەقێیەتی چوونە بۆ ناوچەی خۆشناوەتی لە گوندی (هەرتەل) ماوەیەك خوێندوویانەو پاشان ڕوودەکەنە ناوچەی باڵەکایەتی و لە خزمەتی (مەلا ئەحمەدی مەلا ئادەم) لەوێ بۆ ماوەیەك خوێندوویانە، هەروەها لە گوندی (شێخ وەتمان) لەلای (مەلا محەمەدی کاك عەبدوڵڵا) خوێندوویانە.

پاش ماوەیەك حاجی قادر لە حاجی مەلا عەبدوڵڵای هاوڕێی دادەبڕێ، بۆ درێژەدان بە خوێندن بە تەنها دەچێت بۆ ناوچەکانی کوردستانی ئێران بۆ شارەکانی سەردەشت و سابڵاخ و شنۆ، مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادەش دەگەڕێتەوە بۆ شاری کۆیە.

حاجی قادری شاعیر تا ساڵی (١٢٧٩ك – ١٨٦٢ز) دا هەر لە کوردستانی ئێران ماوەتەوە، لەو ساڵەدا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، دواتر بە دەشتی لاجان و بەڕێی باڵەکایەتی دا گەڕاوەتەوە دیوی کوردستانی عێراق و هاتۆتەوە شاری کۆیە، حاجی قادر لە کۆیە لە مزگەوتی (بابەکر ئاغا) لەگەڵ مەلا عەبدوڵڵای هاوڕێ و (ئەمین ئاغای ئەختەر) ی شاعیر و حەمە ئاغا و کەیفی شاعیر، ماوەیەکی خۆش بەسەر دەبات.

پاش ماوەیەك کە حاجی سەرنج دەدات، دوای ئەو هەموو خەمخۆری یەی بۆ خەڵکی کۆیە هەیەتی، کەچی دەبینێ خەڵکی هەمووی هەر ڕوویان لە هەندێ شێخی وەکو (شێخ نەبی ماویلانی) ە، بەرامبەر بە شاعیرو خەمخۆری وەکو خۆی کەم تەرخەمن و ئەم کەم تەرخەمییەش لە ڕووی سۆزی شاعیرانەوە بەبێ حورمەتی دادەنێ، بۆیە بڕیاردەدا کۆیە جێبهێڵێت و ڕووبکاتە شاری (ئەستەنبوڵ) ی پایتەختی سەڵتەنەت و خەلیفایەتی عوسمانلی.

حاجی قادر کە دەکەوێتە ئەو وڵاتی غوربەتەش لە چەند دێرە شیعرێکی پڕ سۆزی دا ئەو هەستەی خۆی دەربڕیوەو دەڵێ:

لە غوربەت بە شاهی لەبیر ناکرێ
زەمانی جوانی و یادی وڵات
لە (قوشخانە) وە تادمی (ئیج قەلا)
لە (بایز اغا) وە تا محەللەی (قەلات)

## هەموو خزمی خۆمن دەزانم دەڵێن:
## لە بێ حورمەتیمان بوو (حاجی) هەڵات

حاجی قادری شاعیر لە کۆتایی ساڵەکانی تەمەنی پڕ لە حەسرەت و ناخۆشی ژیانی لە ئەستەنبووڵەوە ئەم گەشتەیان دەخاتەوە بەرچاوی مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە[1] هاوڕێی خوێندنی، لە نامەیەکی شیعریدا نووسیوەو دەڵێ:

وەرە بابێینە سەر باسی نیهانی
بە یادی عەیش و ئەییامی جەوانی
بە فیکرت دێ زەمانێ چوینە باڵەك
بە پێ خاوسی نەکەوشم بوو نە کاڵەك
لە بەرپێم دڕك و دار و شاخ و باری
وەکوو مەخمور بوو نەرمی یانە قاڵی
کە چووینە سینگوڕە سینەم گڕی بەست
وەکوو قەندیلی سەر گەردان وەکوو مەست
دەڵێن ئێستا هەواری گورگ و شێران
وەکوو قەلبی حەسوودی تۆیە وێران

حاجی[1] پاش ئەوەی سەری خۆی هەڵدەگرێ و ڕوودەکاتە وڵاتی ئاوارەیی، لە ئەنجامدا لە ئەستەنبوڵ دەنیشێتەوە، وەکو نالی لەو شارە گەورەیەدا گوم نابێ، لە کوردی دڵسۆزی

---

[1] – مەلا عەبدوڵڵای جەلی زادە کوڕی مەلا ئەسعەد (١٨٣٥ – ١٩٠٨) یەکێك لە مەلاو زاناو کەسایەتییە ناودارەکانی کوردستانە، باوکی (مەلا محەمەدی کۆیی) ناسراو بە (مەلای گەورە)، لەو سەردەمەدا لە کۆیە دوو مەدرەسەی گەورە هەبووە، یەکێکیان مەدرەسەو مزگەوتی (حاجی مەلا ئەسعەد) کە بە ناوی باوکییەوە بووە، دووەمیش مەدرەسەی (مزگەوتی گەورە) یە، کە بۆ ماوەیەکی درێژ لەلایەن ئەوەوە بەڕێوە چووە، هاوڕێ و هاوسەردەمی شاعیری گەورەی کورد (حاجی قادری کۆیی) بووە، چەندین مەلاو زانای ناوداری کوردەواری لە مەدرەسەکانی جەلیزادەن و لەسەر دەستی ئەوان پێگەیشتوون و ئیجازەیان پێدراوە، مەولوودنامەیەکی کوردی و هەندێ شیعری فارسی و کوردی لە دوا بەجێماوە............بڕوانە: د. عوسمان دەشتی، مەلا مەعسومی هەورامی، مەلاو زاناو وڵاتپەروەر، لاپەڕە ٥٦، ساڵی ٢٠١٥.

[1] – بڕوانە: مەلا سامان هەڵەبجە، گوڵستان، ژیانی ناوداران و شاعیرانی کورد، لاپەڕە ١١٢، ١١٣، ساڵی ٢٠١٤.

هاورەگەزی خۆی دەگەڕێ، هەندێکیان دەدۆزێتەوە، دیارترینی ئەو کوردانە چەندانێك لە ئەندامانی بنەماڵەی بەدرخان پاشا دەبن.
حاجی لە ئەستەنبوڵ وەکو جوتیارێکی دواکەوتووی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمی کوردستان ناکەوێتە ڕوو، هەروەها وەکو کۆلکە مەلایەکی مردوو شۆر نابینرێ، بەڵکو وەك ڕۆشنبیرێکی شارەزاو هۆشیارو دڵ و دەروون پڕ لە هێزی پێشکەوتن و شۆڕشی خۆی دەنوانێ، لەبەر ئەوە کۆمەڵی تازەپێشکەوتوو لە چاو کومەڵە دواکەوتووەکەی خۆی زیاتر ڕێی بۆ خۆش دەکرد شتی نوێ فێر ببێ، نزیکی ئەستەنبوڵ لە ئەوروپا ڕێگەی بۆ حاجی خۆش کرد بینینی بەرامبەر بە ئەوروپا فراوانتر بێ، ئۆتۆمۆبیل و شەمەندەفەری لەو وڵاتەدا چاو پێ کەوت، لە نزیکەوە ڕۆژنامەو کۆوارەکانی وڵاتی عوسمانی دەخوێندەوە.
بناغەی بوونی حاجی بە ڕۆشنبیرو زانای هاوچەرخ و ڕامیاری و ستراتیجی و دانا لە کۆیە دەستی پێکرد، لە کوردستانەوە ئەم بیروڕا نوێیانە لەلا دروست بوو بوون، بەڵام لە وڵاتی عوسمانی لەم لایەنەوە گەلێ شتی نوێ فێر بوو.
حاجی کە پشتی لە وڵاتی خۆی کرد تەنیا شاعیر نەبوو، هەڵگری بیروباوەڕی نوێی دەرەوەی دوازدە زانستەکەی ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبی بوو، کۆمەڵی نوێ یاریدەی دا ئاسۆی بیروڕای مرۆڤایەتی و نەتەوایەتی زیاتر فراوان ببێ ڕۆژگارانی ماوەی ژیانی حاجی لە وڵاتی عوسمانی زۆر ئاشکرا نییە، ڕاستە ئێمە دەزانین پەیوەندی بە بەدرخانییەکانەوە هەبوو، بەڵام لەو سەردەمەدا ئەندامانی بنەماڵەی بەدرخانییان، خۆیان دەستبەسەر بوون چاوی خەفیە و سیخوڕی وڵات بە دوایانەوە بوون، لە هەموو هەرێمەکانی کوردستانی گەورە بڵاوبووبوونەوە، هەروەها لە ئەستەنبوڵ و شارەکانی سوریا و قاهیرەی میسرو جێگەی دیکە دەبینران، زیاد لەسەر ئەمە لە مەڵبەندی خۆشیان جزیری بۆتان دەژیان.
جا ئێمە ئەوە دەزانین زۆربەی ژیانی ئەو وڵاتەی حاجی لەگەڵ ئەواندا لە ئەستەنبوڵ بوو، بەڵام ڕەنگە لە جێگەی دیکەش لەگەڵیاندا ژیا بێ، جێی وەکو جزیری بۆتان.
سەرچاوەی هەرە گرنگ بۆ ڕوونکردنەوەی ژیانی حاجی هۆنراوەکانی خۆیەتی، چونکە تەنیا هۆنراوەی دڵداری نەوتووە، بەڵکو چۆتە ناو ناخی ژیانی کۆمەڵایەتی نەتەوەکەیەوە، بێگومان ئەم جۆرە هۆنراوانە زانیاری زۆر بە دەستەوە دەدەن، لەبەر ئەوە پێویستە بایەخ بەم جۆرە بەرهەمەی شاعیر بدرێ.

هەرچۆنی بێ لە دوای تەمەنێکی درێژ زۆربەی بۆ خۆی نالەباری بوو، بۆ نەتەوەی بەختیار بوو لە ئەستەنبوڵ، لەساڵی ١٨٩٧ز کۆچی دوایی کردووە و لە ئاوارەیی و بێ کەسیدا سەری ناوەتەوە و لەبەری ئوسکودار، لە گۆڕستانی قەرەج ئەحمەد بە خاک سپێردراوە، !

پاش ساڵێك لە ڕۆژنامەی کوردستان[1] ژمارە ٣ی ساڵی ١٨٩٨ هەواڵی کۆچی دوایی حاجی قادر لەگەڵ پارچە شیعری (زەمانە ڕەسمی جارانی نەماوە) نووسراوە: (عالەك ژ سوهرانی ، اڤ مرۆڤە صاغیا گەلەك خەبتی دەرحەقا علماندنا علم و مەعریفە گەلەك بەیت و ئەشعاراین کرمانجی دنڤیسی سالا دی وەفات کر).

[1] – بڕوانە: ئاراس ئیلنجاغی، حاجی کرمانجێك لەو پەڕی مەزنیدا، لاپەڕە ١١٩، ساڵی ٢٠١٢.

## حاجی قادر و بەرماڵی خادم سوجادە لە کەرکوک [1]:

حاجی قادر هەر چەندە زیاتر ناسراوە و شۆرەتی بە شیعرو شاعیریەتی دەرکردووە، بەڵام ئەم پیاوە لێهاتووە لایەنی زۆر جوامێرانەی هەبووە شایەنی لێدوانە، لەمبارەیەوە د.جەمال محەمەد باجەلان دەڵێ: مامۆستا مەلا سدیق ساڵح گەرمکی کە مامۆستای خۆم بوو، بۆی گێڕامەوەو وتی: لەساڵی ١٩٢٥ز فەقێ بووم لە کەرکوك لە خزمەت مامۆستا مەلا محەمەدی سەرسپی پێکەوە چووینە زیارەتی بەرماڵی پێغەمبەر (د.خ) پاشان چاومان کەوت بە (ڕەفیق ئەفەندی کوڕی حاجی ئەمین) کە ئەوکات تەمەنی لە (٧٠) ساڵ تێپەری بوو، (سادنی ئەم بەرماڵە) بوو، ئینجا ڕەفیق ئەفەندی بۆی گێڕاینەوە کە ڕۆژێك جەندرمەی تورك دەوری مزگەوت و ماڵەکەمانیان ئابڵوقەدا، بە زۆری زۆرداری بەرماڵەکەیان لێ ساندین، وە بەناوی دیاری بۆ سوڵتانی عوسمانی لە ئەستەنبوڵ.

ڕەفیق ئەفەندی دەڵێ، حاجی ئەمینی باوکم وتی: ڕۆڵە خۆت دەزانی ژیانی ئێمە لەسەر ئەم بەرماڵەیە خۆت ئامادە بکە: دوو هێستر لەگەڵ کولیچەو خورماو نان بۆ سەفەری ئەستەنبوڵ، لەگەڵ فەرمانە ڕەسمیەکان بەڵکو بتوانین بەرماڵەکە بگێرینەوە، بە باوکم وت کێ دەناسی؟ کێ یارمەتیمان دەدا.

حاجی ئەمین پێی دەڵێ: ڕۆڵە (حاجی قادری کۆیی) برادەرێکی زۆر خۆشەویستمە یارمەتیمان دەدا، ئەنجا ڕەفیق ئەفەندی دەڵێ: کە گەیشتینە ئەستەنبوڵ بە پرسیار توانیمان حاجی قادر ببینینەوە.

پاش بە خێرهاتنمان و دەربرینی خۆشحاڵی خۆی، باوکم بە حاجی وت: دەزانی بۆچی هاتووین، دەبێ یارمەتیم بدەی، حاجیش بەڵێنی پێداو کەوتە خۆیی و هەوڵدان لەگەڵ دۆست و برادەرانی.

لە کۆتاییا توانی چاوپێکەوتنێك ڕێك بخا لە بەینی (حاجی ئەمینی خادم سوجادە) و (سوڵتان عەبدولحەمید) پاش ئەوەی داواکاری و فەرمانەکەی هاوپێچ کراو خرابووە بەردەم سوڵتان، پاشی دیراسەی فەرمانەکان لە ڕۆژی دیاری کراو.

---

[1] – بروانە: دیداری حاجی قادری کۆیی، لاپەرە ٤٩، ٥٠، ساڵی ٢٠١٦.

سوڵتان بە دەستی خۆی بەرماڵەکەی لەناو سەندوقی تایبەت و فەرمانی نوێی مۆرکراو دایەوە دەستی حاجی ئەمین، جێی باسە لەگەڵ ڕێوڕەسمی دانەوەی بەرماڵەکە بوقو مۆسیقای تایبەت لێدرا وەك ڕێزلێنان لە بەرماڵەکە.

ئەم هەوڵ و توانایەی حاجی قادرو وەفایی بۆ حاجی ئەمینی برادەریی و گێڕانەوەی ئەم گەنجینە گرینگە بۆ کەرکوکی کوردستان، بەڵگەیە لەسەر لێهاتووی حاجی قادرو خۆشەویستی بۆ نیشتمانەکەی.





دەستنووسێکی کۆنی حاجی قادری کۆیی

ئەم وێنەیە لە ئەرشیفی م. ئیدریس عبداللە ئۆمەر گومبەت

# کورته باسێکی مەلا نور محەمەد

لە باسی ئەم زاتە چەند بدوێت هەر کەمە، وەك لێی دەگێڕنەوە پیاوێکی ڕووخۆش و وتارشیرین بوو، بە جۆرێك سەرنجی خەڵکی بەلای خۆی ڕاکێشاوە، لە ڕێکخستنی بۆنەو پەیوەندی کۆمەڵایەتی خزمایەتیدا کەم وێنە بوو، لە جوانی و سوارچاکی و ڕەزامەندی خەڵقیدا بێ هاوتایی سەردەمی خۆی بوو، لەگەڵ هەموو چین و توێژەکانی نزیك و دەوروبەری خۆیدا کەسایەتییەکی بەرزو ئازاو بوێر بوو، ئەوەندەش بێ فیزو هەوا بوو، لەگەڵ منداڵ وەکو منداڵ ئەدوا، لەگەڵ زانا بەزانایی، وەکو فەرمودەی پێغەمبەری خۆشەویست (د.خ) (كلم الناس على قدر عقولهم) واتە: لەگەڵ خەڵکیدا بدوێ بە پێی ئاستی ژیرییان، ئەمەش لە ژیانی (مەلا نور محەمەد) بە دیکراوە.

ناوی تەواوی: نوری ناسراو بە (مەلا نور محەمەد) کوڕی مەلا ئەحمەدی کۆر کوڕی بابارەسولە، ناوبراو لەساڵی ١٨٨٠ز لە دێی ئۆمەر گومبەت لە بنەماڵەیەکی ئایینی لە دایکبوە، دایکی ناوی (خەدیجە کچی حاجی مەلا مەحمودی کۆیی) یە، لە تەمەنی منداڵییەوە لە خزمەتی باوکی قورئانی پیرۆزی خەتم کردووە.

د.جەمال محەمەد باجەلان لە بارەی مەلا نور محەمەد ئەمەی نووسیوە[1]: ئەم پیاوە لە دەشتی دزەیی سەر بە هەولێر مەلایەتی کردووە، لە پاشان بۆتە مەلاو کوێخای دێی سێگردکان، زۆر بە دەست و قامی خۆی ئازاو بە جەرگ بووەو زۆریش زیرەك بووە، خوێندنی مەلایەتی تەواو نەکردووە تا کتێبی سیوطي (البهجة المرضية) ی خوێندووە، کە بەرامبەر پێنج یا شەشی ئامادەیی ئێستا.

مەلا محەمەدی جەلی زادە (مەلای گەورەی) کۆیە لە بارەی زیرەکی مەلا نورمحەمەد دەڵێ: خوا ڕەحمی پێمان کرد کە هەر ئەوەندەت خوێندوو ئەوەندە بلیمەتی، ئەگەر خوێندنی مەلایەتیت تەواو کردبا چیمان بۆ ئەماوە.

ئەم پیاوە توانای شیعر نووسینی نەك بە کوردی، بەڵکو بە عەرەبی و فارسی هەبوە، زۆر بە شارەزایانە (تخمیس) ی شیعری حافزی شیرازی بەناوبانگی کردووە بە عەرەبی کە دەڵێ:

---

[1] – بڕوانە: ڕۆژنامەی تاك، ژمارە ١٨، ساڵی ٢٠٠٦.

فكـــل الخلق بعـــد النشر في طي
ولــــم يبق سوى الباقي هــو الحي
فقل للمــرء دع عنـــك الجهـل والغي
جهان جام و فلك ســاقى اجــــل مى
خـــلايـق بـــاد بنـــوش از مجلس وى

* * *

فسبحان الـــذي بـــــالعبد اســرى
مميت الخــلق والاكـــوان طـــــرا
فيـــا مـن عـــــاش آلافــا ودهــرا
خلاصى نيست اصـــــلا هيـچ كســرا
ازين جـــــام ازيـــن ســـاقى ازيـن مى

جا هەر کەس تۆزێ شارەزای لە عەرەبی هەبێ دەزانێ چۆن داڕشتنێکە؟ چ توانایەکە؟

مـەلا نـور محەمـەد لـەم دێیانـە مەلایـەتی کـردووە لەوانـە: (سێگردکان، خەرابـە، گۆمەشـین، قەسرۆك)، وەك باسمان کرد لە دێی سێگردکان مەلایـەتی کـردووەو لـە هـەمان کاتـدا کوێخـای دێی ناوبراو بووە، دوا شوێنی مەلایەتی لە دێی قەسرۆك[1] بووە، لەم دێیە نەخۆش دەکەوێ و لەساڵی ١٩٣٢ز لە شاری کەرکوك لـە تەمـەنی ٥٣ ساڵیدا کۆچی دوایی کـردووەو لـە گۆڕسـتانی (شێخ محێدینی کەرکوك) بەخاك سپێردراوە.

ئەم زاتە لە ژیانیدا دوو ژنی هێناوە بەم ناوانە: یەکەم ناوی (پەری حەمە گۆج) خـەڵکی دێـی تولکی بووە سەر بە شێخ بزێنی خواروو، لەم ژنە کچێکی بووە بە ناوی (سافیە).

دووەم ژنی ناوی (فاتمە مـەحمود سورچی) ناسـراو بـە فەتـەوم، لـەم ژنـە دوو کـوڕو کچێکی بووە بە ناوەکانی: فاتیح، عەبدولڕەحیم، کافیە.

---

[1] – قەسرۆك دێیەکە سەر بەناوچەی شێخ بزێنی سەروو.

له بارەی مەلا نور محەمەد، کاک محەمەد کوڕی مەلا فاتیح بۆی گێڕامەوە وتی[1]: وەك لێی دەگێڕنەوە باپیرم مەلا نور محەمەد مرۆڤێکی ئازاو چاونەترس و مرۆڤ دۆست بووە، هەروەها زۆر داکۆکی لە کەسانی هەژار و کەمدەرامەت کردووە، لەساڵی (١٩١٥) چووە بۆ غەزاو بەشداری شەڕی شوعەیبەی کردووە لە شاری بەسرە، لە درێژەی باسەکەیدا کاک محەمەد دەڵێ: لەسەر دەستی باپیرم مزگەوتی گوندی سێگردکان بنیادنراوەو پێشنوێژی و ڕێنمایی خەڵکی کردووەو لە هەمان کاتدا کوێخای گوندی ناوبراو بووە، لە ژیانیدا نۆ ژنی هێناوەو بەردەوام چوار ژنی لە ماڵەوە بووەو هەر یەکە و ماڵی تایبەتی خۆی هەبوو.

---

[1] – چاوپێکەوتنی: کاک محەمەد کوڕی مەلا فاتیح کوڕی مەلا نور محەمەد، لە ڕۆژی چوارشەممە ڕێکەوتی (١٨ / ١ / ٢٠١٧) لە ماڵی کاک سەرکەوت- کەرکوك.....نووسەر

# حاجی مەلا محەمەد نور

گەلی کورد لە مێژووی خۆیداو دوای ئاوێتە بوونی بە ئیسلام گەلێك زاناو سەرکردەو پیاوی دڵسۆزی بەجیهانی ئیسلامی بەخشیوە و لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا خاوەنی بەخشش و بەرهەمی پڕ بایەخ بوون بۆ کۆمەڵگەو دەوروبەرەکەیان و دوای خۆیان ئاسەواری کارو زانست و بەخشینەکانیان بەسەر نەوەکانی داهاتووەوە بەجێ هێشتووە، زاناو عەللامەو خاوەن بیر (حاجی مەلا محەمەد نور) یەکێکە لە ئەستێرە پرشنگدارەکانی ئاسمانی زانست و مەعریفە و ئایین پەروەری.

ناوی تەواوی: مەلا محەمەد نور کوڕی مەلا ئەحمەدی کۆر کوڕی بابارەسوڵ و لە بنچینەدا لە ساداتی (پیرخدری) یە، ناوبراو لەساڵی ۱۸۸۳ز لە خانەوادەیەکی ئایینی و نیشتمانپەروەر لە دێی (ئۆمەر گومبەت) لە ناوچەی (تەقتەق) سەر بە قەزای کۆیە چاوی بەژیان هەڵهێناوە، دایکی ناوی (خەدیجە کچی حاجی مەلا مەحمودی کۆیی) یە.

ئەم زاتە هەر لە تەمەنی منداڵییەوە لە خزمەت باوکی دەستی بە خوێندن کردووە چەند وردە کتێبێکی ئەو سەردەمەی تەواو کردووە، لە پاشاندا کە هەندێ پەرەوازە دەبێ، دەچێتە شاری کۆیەو لە خزمەت زانایان و ناودارانی ئایینی ئەو سەردەمە دەستی بە خوێندن کردووەو ماوەیەکی زۆر ئەم مزگەوت و ئەو مزگەوتی گۆڕیوە و ئەم گوندو ئەو گوندی کردووە. لە پاش ماندوو بوونێکی زۆر چۆتە خزمەت زانای پایەبەرزی کورد خوالێخۆشبوو مەلا محەمەدی کۆیی[1] کە بە (مەلای گەورە) ناسراوە.

---

[1] – مەلا محەمەد ناسراو بە (مەلای گەورە) کوڕی مەلا عەبدوڵڵا کوڕی زانای پایەبەرز کاك ئەسعەد جەلی زادەیە، ناوبراو لەساڵی ۱۸۷٦ز لەخانەوادەیەکی مەلا زادە چاوی بەژیان هەڵهێناوە، دایکی ناوی (ئایشە خان کچی بابەکر ئاغای حەویزی) یە. لەساڵی ۱۹٤۳ز لە کۆیە کۆچی دوایی کردووە، بەڵێ ناوبراو پشتاو پشت لەباو باپیرانەوە بە خزمەتی زانستی ئایینی و ئەدەب لە کۆیە و دەوروبەری خزمەتیان کردووە، مەلای گەورە یەکێکە لە پیاوە بەناوبانگەکانی گەلی کورد، زانایەکی نیشتمان پەروەر شاعیرێکی تازە گەر لە رۆژگاری خۆیدا پێش زاناکانی کوردستان کەوتووە، دانایەکی پێشەنگ و لیهاتوو بووە. لە سەردەمە ئاڵۆزو ناخۆشەکانی ژیانیدا کاری بۆ چەمکی تازە گەری کردووە، هەر لەمنداڵییەوە خراوەتە بەر خوێندنی ئایینی و هەموو پلەکانی بەسەرکەوتوویی بڕیوە، پاشان بۆتە پێشنوێژو وتارخوێنێکی بە تواناو پاشانیش مەدرەسەیەکی گرنگی لە شاری کۆیە کردۆتەوە کە خوێندکارەکانی نەك هەر لە شاری کۆیەو دەوروبەری لەوێ خوێندویانە. بەڵکو لەسەرتاسەری کوردستان و وڵاتانی دەوروبەریش ڕوویان تێکردووە بۆ وەرگرتنی زانست و خوێندەواری و چەندین نەوەیش لە زانایان لەسەر دەستی ئەم زاتە پەروەردەکراون کە ڕۆڵی گرنگیان هەبووە لەپێگەیاندنی مرۆڤی کورد و ڕۆشنکردنەوەی بیریان، یەکێ لە فەقێکانی حاجی مەلا محەمەد نور بووە.......بڕوانە: برگەکانی فیستیڤاڵی یادەوەری (مەلای گەورە) لاپەڕە ۹، ساڵی ۲۰۰۹.

لەلای ئەم زاتە پەرەی بە خوێندن داوەو لە خزمەتی زانستە شەرعییەکانی تەواو کردووەو پاشان ئیجازەی مەلایەتی لێ وەرگرتووە، جل و بەرگی مەلا محەمەد نور بریتی بووە لە کەواو سەڵتەو جبەی لەبەر کردووەو مێزەری لەسەر ناوە، باڵای مام ناوەند بووە، پیاوێکی بە هەیبەت و رووخسارێکی زۆر جوانی هەبووە، گەنم رەنگ بووە، ریشێکی رەشی قەڵەمی هەبووە، زۆر گرنگی بە پاك و خاوێنی داوە، لە زمانی نەحوی زۆر بەلیغ بووە، هەروەها شارەزایی لە زمانی عەرەبی جلفە هەبووە، پاش وەرگرتنی ئیجازەی زانیاری لە کۆیەدا، لەسەر داوای حەمە ئاغای کۆیە[1] بۆتە مەلای دێی (خدران) و ماوەیەکی زۆریش لە دێی ناوبراو خزمەتی ئایینی بە خەڵکی ئەو ناوچەیە گەیاندووە، لە پاشان دا رووی کردۆتە دێی (دووگردکان) لە ناوچەی (قوشتەپە) ی سەر بەپارێزگای هەولێر و لەوێ بۆتە مەلای ئەو گوندە و ماوەیەکی زۆریش لەوێ ماوەتەوە.



**حەمە ئاغای کۆیە**

---

[1] – ناوی تەواوی: حەمە ئاغا کوڕی مەحمود ئاغا کوڕی حەمە ئاغا کوڕی کەریم ئاغا کوڕی غەفورە، لە کۆیە بە بنەماڵەی غەفووری ناسراون، ناوبراو لەساڵی ١٨٣٨ز لە دایکبوە، ئەم زاتە یەکێ بوو لە کەسایەتییە ناسراوەکانی سەردەمی خۆی، خاوەن دیوەخان و مەجلیسی بەردەوام جمەی هاتووە، بە پیاوچاك و خێرخواز ناوبانگی دەرکردووە، لەساڵانی ١٩١٧ – ١٩١٨ کاتێ گرانی و برسێتی ڕووی لە خەڵکی کردووە، حەمە ئاغا ڕۆڵی باڵای هەبووە و بە دەیان مرۆڤ لە برسی و مردن ڕزگارکردووە، گەلێ خزمەتی بە ناوچەی کۆیەو دەوروبەری کردووە و تا لەساڵی ١٩٢٠ ماڵئاوایی لە جیهان کردووە.... بڕوانە: جەمال بابان، اعلام الکورد، بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٧٠٧، ساڵی ٢٠٠٦، وەرگێڕانی بۆ کوردی.....نووسەر.

لەمبارەیەوە د.عوسمان دەشتی دەڵێ: کاتێ حاجی مەلا محەمەد نور، لە گوندی (دووگردکان) لە دەشتی هەولێر مەلا بووە، مەدرەسەیەکی گەورە و ئاپۆرەی هەبووە، بە هۆی ناوبانگی مەلا چاکییەوە فەقێ لە هەموولایەکەوە دەچوونە لای، ئاغاکانی گوندیش بنەماڵەی (ئەحمەدی حەمەدەمین ئاغای دزەیی)، لەو ڕێگایەدا و لە خزمەتی مەلاو مزگەوت و مەدرەسەی دێیەکان درێغییان نەکردووە، مەلا مەعسومی هەورامی[2] کە پورزای حاجی مەلا محەمەد نور بووە، یەکێ بووە لە فوتابێکانی مەلا محەمەد نور بۆ ماوەی ساڵێك لە خزمەتی خوێندوویەتی.!

دواجار گەڕاوەتەوە بۆ زێدی خۆی گوندی (ئۆمەر گومبەت) لەوێ بووە بە مەلای گوندەکە، کە لە پاش چەند ساڵێك رووی کردۆتە گوندی بیرەسپانی گەورە لە ناوچەی ساڵەیی بووە بە مەلای گوندی ناوبراو.

جا خوالێخۆشبوو شێخ تاهیر شێخ شەریف[3] کە نێشتەجێی گوندی بیرەسپان بووە زۆر ڕێزو حورمەتی ئەم زاتەی گرتووە و دەستی یارمەتی بۆ درێژ کردووەو ماوەیەکی زۆر لەوێ ماوەتەوەو لە ڕێگەی ئایینی پیرۆزەوە خزمەتێکی بێ پایانی بە دانیشتوانی ئەو ناوچەیە گەیاندووە، دواتر لەسەر داوای شێخ تاهیر دەگوازێتەوە بۆ ئاوایی (کارێز) کە لە نزیك گوندی بیرەسپان بووە، چونکە شێخ تاهیر ماڵێکی تریشی لەو گوندە هەبووە، ئەمەش زیاتر بۆ ئەوە بووە، کە حاجی مەلا محەمەد نور تووشی نەخۆشییەکی کوشندە هاتبوو، بۆ ئەوەی لەوێ زیاتر بحەسێتەوە و پشوویەك بدات.

---

[2] - بڕوانە: مەلا مەعسومی هەورامی، مەلاو زاناو وڵاتپەروەر، د.عوسمان دەشتی، لاپەڕە ٣٣، ساڵی ٢٠١٥.

[3] – شێخ تاهیر کوڕی شێخ شەریف، لەساڵی ١٨٨٧ز لە بنەماڵەیەکی ئایینی و نیشتمان پەروەر چاوی بەژیان هەڵهێناوە. ناوبراو پیاوێکی ناودارو بە ئایین و چاوتێرو میوان دۆست و جوامێر بووە، لەساڵی ١٩٤٩ز لە تەمەنی ٦٢ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی (شێخ محێدینی کەرکوك) بەخاك سپێردراوە.......بڕوانە: گۆڤاری گزنگ، ژمارە ٣٤، لاپەڕە٣٨، ساڵی ٢٠٠٦.

دێی کارێز ئاو و هەوای خۆش بووە و شوێنێکی دلگیر بووە، لە وەسفی دێی کارێز شاعیر[1] دەڵێ:

کارێزی شوان ئـــەی هەوارگـــەی بـــەرزو پیرۆز
مەنزڵـــگای منداڵی و سەرچاوەی خۆشەویستی و سۆز
ژیان و ژووان ســـەیرانگـــای بەهـــارو جەژنی نەورۆز
دیاری یەزدان بــۆ بـــەختیاری کـــامەرانی هـــۆز

هەروەها د.عەبدولستار[2] تاهیر شەریف دەڵێ: دێی بیرەسپان یەکێ لەو دێیانە بوو، جگە لە مزگەوتی دێیەکە حوجرەی فەقێی تێیدا هەبوو، مەلای دێیَ منداڵانیان فێری قورئان خوێندن دەکرد، لە دێهاتەکانی دەوروپشتمان فەقێ و موستەعید (مستعيد) دەهاتن بۆ مزگەوتی بیرەسپان و لای (مامۆستا حاجی مەلا محەمەد نور) شەریعەت و فقهیان دەخوێند، ئەو زاتە یەکێ بوو لە گەورە زاناکانی ئەو سەردەمەو شاعیرێکی بە توانا بوو، گەڵێ قوتابی و فەقێ و مەلای باش باشی پێگەیاند.

لەمبارەیەوە مەلا ئەحمەد کوڕی حاجی مەلا محەمەد نور بۆی گێڕامەوەو وتی: باوکم بەردەوام فەقێی هەبوو، بە دەیان فەقێ و قوتابی لەلای خوێندوویانەو پێگەیشتوون لەوانە: (مەلا محەمەد ئۆمەر گومبەت باوکی مەلا قادر ﴿ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق﴾ لە بەغدا، مەلا عەلی ئۆمەر گومبەت، مەلا مەعسوم هەورامی باوکی د.فوئاد مەعسوم ﴿سەرۆك کۆماری عێراق﴾، مەلا سدیق تەقتەق، مەلا سەید شێخ محەمەد باوکی مامۆستا سەید جەلال بەرزنجی ﴿سەرۆکی لیژنەی فەتوا لە کەرکوك﴾، مەلا عەبدوڵڵای سەبحەو..........هتد.!

---

[1] - بڕوانە: سەیفەدین سابیر، سکاڵای خاك، شیعر، لاپەڕە ٧٩، ساڵی ٢٠١٥.
[2] - یادداشت، ململانێ لەگەڵ ژیاندا، دکتۆر عبدالستار تاهیر شەریف، لاپەڕە ٢٣، ساڵی ٢٠٠٨.

# حاجی مەلا محەمەد نور و سەید ئەحمەدی خانەقا[1]

مەلا ئەحمەد[2] کوڕی حاجی مەلا محەمەد نور بۆی گێڕامەوەو وتی: سەید ئەحمەدی خانەقا خاوەن دیوەخان و خانەقایەکی بێ وێنە بوو، هەروەها پیاوێکی زاناو عاقڵ و تێگەیشتوو شاسواری سەردەمی خۆی بوو، پەیوەندی لە نێوان باوکم و سەید ئەحمەد زۆر بە هێز بوو، باوکم چوار زمانی بەباشی دەزانی، شیعری بە کوردی و فارسی و عەرەبی و تورکی نووسیوە، کاتێ باوکم دەهاتە کەرکوك دەچووە خانەقا، سەید ئەحمەد زۆر ڕێزی لە باوکم دەگرت و (١٠ ڕۆژ یان ١٥ ڕۆژ) لای خۆی گلی ئەدایەوەو زۆر جار بە هەر چوار زمانەکە شیعریان بۆ یەکتری دەخوێندەوە.

وەك باسمکرد پەیوەندی سەید ئەحمەد لەگەڵ حاجی مەلا محەمەد نور زۆر خۆش بوو، ڕۆژێ سەید ئەحمەد بە باوکم دەڵێ: ڕاستە کوڕی مەلا ئەحمەدی کۆری، ئەمما خۆشەویستی من بۆ تۆ لەبەر جەوهەرو شەخسییەتی خۆتە، هەروەها پێی وتووە چ مزگەوتێکت دەوێ بە مەعاشێکی باش دادەمەزرێنم، لەوەڵامدا باوکم وتی: من مەعاشی حکومەت وەرناگرم لەبەر ئەوەی حەرامە، بۆیە منەتی کەس هەڵناگرم.

---

[1] – سەید ئەحمەدی خانەقا کوڕی شێخ حوسێن کوڕی شێخ قادری سور کوڕی حاجی شێخ ئەحمەدی سەرداری بەرزنجییە. ناوبراو لەساڵی ١٨٦٨ز لە شاری کەرکوك لە خانەوادەیەکی ئایینی چاوی بەژیان هەڵهێناوە، ئەم زاتە یەکێ بووە لە پیاوچاکان و گەورەی سادات و شێخی زەمان و سەرۆکی مەشقی کەڵەپیاوانی سەردەمی خۆی بوو، مرۆڤێکی دەس بڵاو سەخی تەبیعەت و خوداناس و شاعیرێکی لێهاتوو بووە، خاوەن خانەقاو دیوەخانێکی بێ هاوتاو بوو، سفرەی سەخاوەتی بۆ پیرو جوان، بۆ ئەهلی لادێ و شارستان ڕاخستبوو، فەخری کوردستان و شێری مەیدان بوو، خانەقاکەی قیبلەگای هوونەرمەندان و زانایان بوو، لە گشت لایەکی کوردستانەوە خەڵکی ڕوویان تێدەکرد، ئەمە جگە لە سۆفی و فەقێ و هەژارو کەمدرامەت، لەساڵی ١٩٥٢ز لە تەمەنی ٨٤ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووەو لە خانەقا بەخاك سپێردراوە........بڕوانە: سیروان سەرگەڵوویی، خانەقای سەید ئەحمەد لە ئامێزی مێژوودا، ساڵی ٢٠١٥.

[2] – چاوپێکەوتنی: مەلا ئەحمەد کوڕی حاجی مەلا محەمەد نور، لە ڕێکەوتی (٩ / ٦ / ٢٠١٦) دارەتوو– هەولێر.....نووسەر.

لە ئەنجامدا سەید ئەحمەد دەفەرموێ: باشە وەرە لە خانەقا لای خۆمان لە مزگەوت دەس بەکار بە تا نانێك مابێ بەیەکەوە دەیخۆین، خۆت و ماڵ و منداڵت بە خێو دەکەم، باوکم سوپاسی سەید ئەحمەد دەکات و پێی دەڵێ: نایەم.

هەروەها جارێکیان لە خزمەت باوکم هاتین بۆ کەرکوك چووینە خانەقا، ئەو کات من نیوچە جاحێل بووم، باوکم نەخۆش بوو، سەید ئەحمەد لە خانەقاوە لەگەڵ باوکم بە پێ هات منیش لە خزمەتیان بووم، چووین بۆ نەخۆشخانە کە ئێستا دەکەوێتە بەرامبەر بانکی (رافدین) نزیك پردەکە، پاش خوێن وەرگرتن لە باوکم و چارەسەری بۆ کرا دواتر گەڕاینەوە بۆ خانەقا.

مەلا ئەحمەد لە درێژەی قسەکانیدا وتی: پیاوێك هەبوو بە ناوی (نوری عەبدوڵڵا) زۆر موخلیسی باوکم بوو، فرۆکەوان بوو لە کەرکوك دادەنیشت، لە بنەڕەتدا خەڵکی کۆیە بوو باوکمی دەعوەت کرد، شەو لەوێ ماینەوە، بۆ بەیانی گەڕاینەوە خانەقا، سەید ئەحمەد بە باوکمی وت: گەڕۆك بوویتە لە کوێ بوی؟ باوکم وتی: چا نییە نالێی بەڕەڵا بوویتە، سەید قاقا پێ دەکەنێ.

مەلا ئەحمەد لە درێژەی باسەکەیدا دەڵێ: مودیری ئەوقافی کەرکوك کەخەڵکی موسڵ بوو، هەموو ئێوارانێك دەهاتە خانەقاو قاوەی لای سەید ئەحمەد دەخواردەوە، ڕۆژانە مەلاکانی کەرکوك دەهاتن بۆ لای سەید ئەحمەد لە خانەقا میوان دەبوون.

ماوەیەك باوکم لای سەید ئەحمەد بوو لە خانەقا، وەك پێشتر ئاماژەم بۆ کرد زۆر جار سەید ئەحمەد بە دە ڕۆژ یاخود زیاتر لای خۆی گلی ئەدایەوە، منیش بۆ هەواڵ پرسین لە باوکم چووم بۆ خانەقا، جا بۆ ئێوارە مەلاکانی کەرکوك هاتن بۆ خانەقا، سەید ئەحمەد لە کاتی عەسران لە حەوشەی خانەقا دادەنیشت، منیش لای باوکم لە خزمەت سەید ئەحمەد دانیشتبووین، ئیتر وردە وردە مەلاکانی کەرکوك هاتن و زۆر قەرەباڵغ بوو، منیش لە شوێن خۆم هەڵسام، ئیتر مەلاکان لە دەوروبەری سەید ئەحمەد کۆبوونەوە، باوکم لە تەنیشت سەید دانیشتبوو، مودیری ئەوقاف یەك بە یەك لە مەلاکانی دەپرسی مەعاشت چەندە تا نۆرە گەیشتە مەلا محەمەد نورو پێی دەڵێ: مەعاشت چەندە، لەوەڵامدا باوکم پێی وت: مەعاشم نییە! مودیر دەڵێ: بۆ مەعاشت نییە ئەی تۆ مەلا نیت؟ مەلا ئەحمەد کوڕی مەلا محەمەد نور دەڵێ: ئاگام لێ بوو پێش ئەوەی باوکم وەڵامی مودیری ئەوقاف بداتەوە.

سەید ئەحمەد هاتە جواب و وتی: بەڵێ مەلایە، عیلمی ئەم مەلایانە لەسەر تەرازوویەك دابنێی، وە عیلمی مەلا محەمەدی نور لەسەر تەرازوویەك دابنێی، هێشتا بەلای مەلا محەمەد نور دەشکێتەوە، جا مودیر لە مەلاکانی پرسی وایە؟ مەلاکانیش هەموویان ووتیان بەڵێ ئەو ئەگەر لە مەجلیسێك بێت یا بابەتێکی شەرعی هەبێت، تا ئەو بڕیار نەدا ئێمە بۆمان نییە قسەی تیا بکەین.

مودیر دەڵێ: باشە بۆ مەعاش وەرناگری، لەوەڵامدا باوکم پێی وت: تۆ ئەگەر ئیشێکی نا قانونی بکەی یاخود درۆیەك بکەی، ئەمانەی لێرە دانیشتوون پێت دەڵێن: تصدگ واتە: ڕاستەکەی، چونکە ئەمانە مەعاش خۆری دەوڵەتن، بەڵام من مەعاشم نییە بۆیە دەتوانم پێت بڵێم: تکذب واتە: درۆدەکەی.! بۆیە مەعاشی حکومەت وەرناگرم چونکە تێکەڵو پێکەڵە.



سەید ئەحمەدی خانەقا

# حاجی مەلا محەمەد نور

# زانایەکی خواناسی راستەقینە

مامۆستا مەلا محەمەد ساڵح[1] وا باس لە مەلا محەمەد نور دەکات: خوالێخۆشبوو حاجی مەلا محەمەد نور ئۆمەر گومبەت مەلایەکی زۆر زاناو و دانا بوو لەو سەردەمەدا، دوانزە عیلم بوو، بلیمەتی عەسری خۆی بوو، لەبەر زانایی و بەڕێزی و خواناسی، هەموو مەلاکان لە ناوچەی خۆیاندا گەردن کەچ بوون بۆی، بەڵام لە بارەی نەبوونییەوە هەر چەند باسی بکرێت هەر کەم بوو.

داماوێکی کلۆڵی جەم بە جەم و جبەیەکی کۆن و مێزەرێکی بچووك و بەرگێکی نا تەواو، لە دوای جەنگی جیهانی دووەم حاجی مەلا محەمەدی نور رۆژێك دەچێتە لای حاجی شێخ جەمیل[2] کە شێخی تەکیەی تاڵەبانی بوو لە کەرکوك، پەیوەندی لە نێوان ئەم دوو زاتە زۆر پتەو بوو، بەرێکەوت سەید ئەحمەدی قازی بەرێوەبەری ئەوقافی کەرکوك میوانی شێخ جەمیل دەبێت، لەم کاتەدا حاجی شێخ جەمیل دەکەوێتە مەدح و سەنای حاجی مەلا محەمەد نور، یەکجار زۆر هەڵی دەنێت بۆ جەنابی سەید ئەحمەدی قازی وەك ئەم پیاوەش هەر پیاوێکی زۆر ماقوڵ و پیاوانە بوو، علیم و تێگەیشتوو بوو، ئەم مەدحانەی جەنابی شێخ وای کرد ئەم پیاوەش زۆر ئیخلاسی پەیدا کرد بۆ مامۆستا حاجی مەلا محەمەد نور.

---

[1] - بڕوانە: گۆڤاری کەرکوك، ژمارە ٤، لاپەڕە ٢٦، ٢٧، ساڵی ٢٠٠٩.

[2] - حاجی شێخ جەمیل کوڕی شێخ محەمەد عەلی کوڕی شێخ عەلی گەورە کوڕی عەلامە (شێخ عەبدولڕەحمانی خاڵس) ە، ناوبراو لەساڵی ١٨٩٠ز لە بنەماڵەیەکی ناسراوی شاری کەرکوك لە دایکبوە، ئەم زاتە زانستەکانی فیقەو شەریعەتی لەسەر دەستی زانایانی ئەو سەردەمەی کەرکوك خوێندووە، لەوانە: مەلا مەحمودی مەزناوە و مەلا ڕەزای واعیزو مەلا سلێمان سالم و چەند مەلایەکی ناوداری دیکەی کەرکوك، ڕێبازی قادری لەسەر دەستی باوك و باپیری وەرگرتووە، تەکیەی تاڵەبانی لە سەردەمی شێخ جەمیل دەبێتە مەڵبەندی کۆڕو جێگای دانیشتنی زانایانی کەرکوك، هەروەها خوێندنگەیەکی گەورەش دەکاتەوە، کە باشترین مامۆستا تێیدا دەرس دەڵێنەوە و لە هەموو بەشەکانی کوردستان فەقێ ڕوویان لە تەکیە کردووە، تەکیەی تاڵەبانی لەناو خەڵك بە تەکیەی شێخ جەمیل ناودەبرێت، چونکە زیاتر لە چل ساڵ شێخی ئیرشادی ئەو تەکیە بووە، لەساڵی ١٩٦١ز لە تەمەنی ٧١ ساڵیدا لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کردووەو لە تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکوك بەخاك سپێردراوە.........بڕوانە: گۆران فەتحی، شاری کەرکوك، مەزگەوت و تەکیەو خانەقاو زاناو پیاوەئایینییە ناودارەکانی، لاپەڕە ٢١٨، ساڵی ٢٠١٢.

جا سەید ئەحمەدی قازی رووەدەکاتە حاجی مەلا محەمەد نور و پێی دەڵێت: مادام جەنابت لەم وڵاتە دادەنیشی، مەلایەکی ئاوهای وەکو جەنابی شێخ باسی کردی بۆ نایەیتە لای من بەڵکو لە مزگەوتێك دات بمەزرێنم، لە وەڵامدا حاجی مەلا محەمەد نور پێی دەڵێ چونکە من مەلام لەبەر ئەوە نایەم بۆ لای تۆ.

جا ئەلێرانەدا هەڵوێستێك بکە لەسەر فەرمایشتەکەی مامۆستا حاجی مەلا محەمەد نور، لەگەڵ ئەمەشدا پێشینان وتوویانە (نعم الامير على باب الفقير، بئس الفقير على باب الامير)، ئەگەر کەسێك بەڕاستی مەلا بێ دەبێ خەڵك بچێتە خاك و پای نەك ئەو ببێ بەخولخولەیەك و بخولێتەوە لەملاو لەولاو لەم کون و لەو کون و لەم دەرگەو لەو دەرگە، بە پێچەوانەی ئەمانەوە دەبێ هەردەم بەو شێوە بێت کە وتراوە (العلم يُزار، ثم يُزار، ثم يُزار) نابێ حورمەتی خۆی و جبەو مێزەرەکەی و چینەکەی لە دەس بدا.

ئەگەر حورمەتی خۆی نازانێ با حورمەتی جبەو مێزەرەکەی بزانێ، وەك هیچ نەبێت با لەبەریان نەکات، ئەوەندە چینی مەلاکان نەکات بەبنێشتی بن ددانی ئەم گەلە پڕ ئێش و دڵ رەنجاوە

## پیاهەڵدانێکی حاجی مەلا محەمەد نور بە شیعر:

وەك پێشتر ئاماژەم پێکرد ئەم زاتە گەڵێ شیعری هەبووە و بە چوار زمان شیعری هۆنیوەتەوەو ناز ناوی شیعری (نوری) بۆ خۆی هەڵبژاردووە، بابێینەوە سەر پیاهەڵدانەکە.

لە مبارەیەوە د. مەلا جەمال محەمەد باجەلان ئەمەی نووسیوە[1]: لە کۆنەوە مامۆستایانی شارەزا لە بوارێکی تایبەت ئەگەر کتێبێکیان دابنایە، داوایان لە مامۆستایانی مەشهورو هەڵکەوتوو دەکرد (تقریظ)- پیاهەڵدان، وەك پشتگیری کردن لە دروستی و جوانی کتابەکەیان بۆ بنووسن، لەم سەردەمە دەڵێن مراجعە و تەقدیم واتە پێداچوونەوە پێشەکی نووسین، ئینجا زانای بەناوبانگی هەولێر (حوسێنی شێخ سەعدی) کە تەفسیری قورئانی نووسی بە زمانی کوردی بە ناوی: (زیانی ئینسان لە تەفسیری قورئان) بەر لە سەدەیەك پێش

[1] - بڕوانە: ڕۆژنامەی تاك، ژمارە ١١، لاپەڕە (٥) سالی ٢٠٠٥

ئێستا کە ویستی چاپی بکا وا دیارە هەندێ پێیان سەیر بووە ! چۆن دەبێ تەفسیری قورئان بە کوردی بنووسرێتەوە !

ئینجا ئەویش پەنای بردۆتە بەر ئەو مەلایانەی کە زۆر لێهاتوو بوونە لەم سەردەمە و ڕۆحی کوردایەتیان بەهێز بووە، ساڵی چاپکردنی تەفسیرەکە (١٣٥٠ك - ١٩٣٤ز) بووە، مامۆستای ناوبراو لەبەر بێ دەرامەتی و کزی گیانی کوردەواری زۆر دواکەوتووە لە چاپکردنی تەفسیرەکە، ئینجا لە لاپەڕەی یەکەمی تەفسیرەکە حاجی مەلا محەمەد نور بە هۆنراوە پێشەکییەکی بۆ نووسیوە بە ناونیشانی ( گەلێ شوکری خودا کەن ئەی گەلی کوردان):[٢]

گەلێ شوکری خودا کەن ئەی گەلی کوردان
کە بەختی بەد بەریدان و لە خەو هەڵسان
ژیانی دا بە ئینسان فکری تاسیسی
ئەساسی عیلمی دانا بۆ هەموو کوردان
فەریدەی دەهرە سەعدی زادەی بێ هەمتا
جەزای چاکەی کەرەم کەی خالقی مەننان
حوسێنی شێخی سەعدی، سەعدی پڕ غیرەت
بەکوردی ئەو بەیانی کرد مەعانی ئایەتی قورئان
لە (نووری) گەر ئەپرسن ساڵی تەئریخی
بە تەفسیری حوسێن سەهل بوو قورئان

ئینجا مۆرو ناوی خۆی بەم شێوەیە نووسیوە: (ئیمام و مودەڕیسی ئۆمەر گونبەد، محەمەد نور ١٣٥٠ کۆچی)، ئەوەی پێویست بێت ئاماژەی بۆ بکرێ کە سێ جار گەلی کوردان یا بە (کوردی) یا هەموو کوردان، ئەمە دیارە ڕەتکردنەوەی نەیاری نووسینی تەفسیری کوردی بۆ قورئانی پیرۆزە.

---

[٢] - ئەم پارچە شیعرە لە گۆڤاری کاروان ژمارە ٨٥ ساڵی ١٩٩١ لەلایەن شێخ عوبێد شێخ لەتیف بەرزنجی بڵاوکراوەتەوە... نووسەر.

دووەم: مەبەستی لە نیوەی شیعری کۆتایی مێژووی ساڵی پیاهەڵدانەکەیە کە بە حروفی ئەبجەد بەیانی کردووە.!

لەمبارەیەوە نووسەر مەلا شاخی[1] بۆی گێڕامەوە و وتی: تەواوی ئەو هۆنراوەیە لای من پارێزراوە و لە کاتی خۆی مەرحوم ماموستا حاجی مەلا محەمەد نور لەسەر ڕێنووسی کۆن بە خەتی خۆی لەسەر کتێبی مونجد (مُنجد) کە هی باوکم بوو مەلا محەمەدی شەل، نووسیبووی، بەڵام بە داخەوە لە کارەساتی ئەنفالدا کتێبەکە لە ناوچوو، هۆنراوەکە بەم شێوەیە هاتووە، کە ئێمەش وەك خۆی بڵاوی دەکەینەوە:

گەلیٚ شکری خدا کەن ای گەلی کوردان

کە بختی بد بریدان و لەخەو هلسان

حسین شیخ سعدی عالمی فاضل

بیانی کرد بە کوردی آیتی قرآن

ژیانی دا بە انسان فکری تأسیسی

اساسی علم دانا بو هەموو کوردان

نیشانی سعدە سعدی زادی پر غیرت

جزای چاکەو کرم کەی خالقی منان

لە نوری گر دەپرسی سالی تأریخی

(بە تفسیری حسین سهل أبو قرآن)

امام ومدرس / عمر کونبد

محمد نور ١٣٥٠

[1] - بە سوپاسەوە ئەم هۆنراوەیە لە بەڕێز کاك مەلا شاخی لە ڕێکەوتی (٢٨ / ٣ / ٢٠١٧) وەرگێڕاوە، سەقزلی- کەرکوك......نووسەر.

## حاجی مەلا محەمەد نور و بێستانی کارێز:

شێخ وەهاب لە زاری باوکی بۆی گێڕامەوە و وتی[1]: مامۆستا حاجی مەلا پیاوێکی ڕاسگۆ و مبارەك و خوا بەشی دابوو، لە گوندی (کارێز) پارچە بێستانێکم هەبوو، کە (تورۆزی و کالآك و شەمامە) تیا لە خۆگرتبوو، جا بۆ پشوودان نیوەڕۆ گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، مامۆستا حاجی مەلا لە ماڵەوە بوو، پێی وتم: لە بێستان دەگەڕیتەوە؟ وتم: بەڵێ مامۆستا، فەرموی: کوڕم تەها تورۆزییەك خواردنێك لە گەڵ خۆت بهێنایە؟ عەرزم کرد قوربان ئێمە مەڕمان کردۆتە نێو بێستانەکەو هیچی تیا نەماوەو مەڕ گشتی خواردووە، مامۆستا فەرموی: کوڕم خوا رازیقی رزقە بگەڕێوە بەڵکو ئەمە خوایە تورۆزی لێ ما بێ، وتم بەڵێ باشە مامۆستا وا دەچم، کاتێ چووم دەبینم لە نێو بێستانەکەدا یەك ڕیز تورۆزی ناسکی لێ ماوەو هیچی لێ نەهاتووە، جامانێکەی سەرم پڕ کرد لە تورۆزی و گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، مامۆستا فەرموی: ها کوڕم! وتم: سبحان الله. مامۆستا یەك ڕیز تورۆزی جوان و ناسکی لێ مابوو، مامۆستا فەرموی: خوا رازیقە و بەندەکانی خۆی بێ بەش ناکات.



شێخ تەها شێخ تاهیر بیرەسپان

[1] - چاوپێکەوتنی: شێخ وەهاب شێخ تەها، لەڕێکەوتی (١٢ / ٦ / ٢٠١٧) اسری و مفقودین - کەرکوك.......نووسەر.

## ڕووداوی ئاگر کەوتنەوە:

لەمبارەیەوە شێخ وەهاب بۆی گێڕامەوە و وتی: لە باوکی خۆم بیستووە: کاتی درەو کردن بوو لە ناوچەکەدا، پیاوێك بە ناوی مام ڕەشید لە گەڵ خێزانی لە ژوور ئاوایی بیرەسپان پارچە عەرزێکی هەبوو درەوی جۆیان لێ دەکرد، جا مام ڕەشید جگەرە کێش بوو، دایم پاکەت و چەرخی پێ بوو، کوڕێکی هەبوو بە ناوی فازڵ، مام ڕەشید پاکەت و چەرخەکەی لە سەر ئیش لە بیر دەچێ، فازڵ کوڕی یاری بە چەرخەکەی باوکی دەکاو لە ناکاوە ئاگرێکی بە خووڕ لە ناوچەکەدا بەر دەبێت، خەڵکی ئاوایی زۆر هەوڵیاندا بێ فایدە بوو، جا منیش بە پەلە بە سواری ماین هاتم بۆلای مامۆستا حاجی مەلا، عەرزم کرد مامۆستا ئاگرێکی گەورە بەر بووە و چارەسەرێکمان بۆ بکە، مامۆستا فەرموی: تەها کوڕم بڕۆ بەردێکم بۆ بشۆو بیهێنە، پاش شۆشتنی بەردەکە مامۆستا ئایەتێکی لەسەر خوێندوو دایە دەستم و فەرموی: بڕۆ بە ڕاکردن بۆ پێش ئاگرەکەو بڵێ: (بسم الله الرحمن الرحیم) فریدە نێو ئاگرەکەوە، منیش بە پەلە سوار ماینەکەم بووم و چوومە پێش ئاگرەکەو بەردەکەم فریدایە نێو ئاگرەکە، بە ئیرادەی خوا ئاگرەکە لە شوێن خۆی وەستاو کوژایەوەو خەڵکەکە لە ترس و دڵەڕاوکێ ڕزگاری بوو، ئەمەش بە هیمەتی خوداو بەرەکەتی مامۆستا حاجی مەلا بوو، (ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت).

# کۆچی دوایی حاجی مەلا محەمەد نور

ئەم کەڵەپیاوە لەساڵی ١٩٢٤ز لە گوندی ئۆمەر گومبەت بە ماڵ و منداڵەوە هاتۆتە گوندی (بیرەسپان) لە ناوچەی ساڵەیی سەر بە شارۆچکەی پردێ نیشتەجێ بووە، خەڵکی ناوچەکە زۆر دڵ خۆشبوونە بە هاتنی مەلا محەمەد نور بە گەرمی پێشوازیان لێ کردووە، چونکە مەلایەکی زیرەك و شارەزایەکی باشی بووە لە بواری ئایین و شیعرو چارەسەری سروشتی (اعشاب) و بە پێی ووتەی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە، گەلێ سوود بەخش بووە بۆ خەڵکی ئەو ناوچەیەو بە دەیان نەخۆش لەسەر دەستی ئەو زاتە چارەسەریان بۆ کراوە.

نووسەر شێخ عوبێد بەرزنجی لە بارەی مەلا محەمەد نور ئەمەی نووسیوە[1]: ئەو پیرە پیاوانەی کەوا لە سەردەمی شاعیردا لاو بوونە چاویان پێکەوتووە و لەگەڵیدا ژیاون دەگێڕنەوە و دەڵێن: شاعیر مرۆڤێکی ڕاست بێژ و دەست و داوێن پاك و قسەزان خواناسێکی ڕاستەقینە بووە.!

لە بارەی ڕێبازی تەسەفەوە سالیکێکی باش بووە و ئادابی زیکرو فیکری بەجێهێناوە و تەریقەتی (قادری) لە خزمەتی (شێخ عەبدولڕەحمان) ی کچەزای شێخ نورەدینی بریفکانی وەرگرتووە، تا دوا ژیانی ئەم ڕێبازەی بە تەواوی پەیڕەو کردووە، مەحسووبێکی تەواوی ئەو زاتەو ئەو بنەماڵەیە بووەو گەلێ جار لە شیعرەکانی دا دەست نیشانی بۆ ئەم ڕاستیە کردووە، کە لە پارچە شیعرێکیدا دەڵێ:

**وای بۆ ئیزنی سلووکـــان بــۆ فەقیرو بــۆ مەلــووکــان**<br>
**پێ کــەرە کـــاشای بریفکـــان مەئزوونی قوتبی موبین**<br>
**مەئــزوونی قوتبی گەیلانی بــا پیری خۆی غەوسی سانی**<br>
**قوتبی عالـــەم بریفکـــانی جــەددی خۆیەتی نورەدین**<br>
**(نــوری) موزنیب و عاسی پــڕ لـــە دەردو قەلبی عاسی**<br>
**(یــوم یؤخــذ بــالنواصي) ئەو لــەگەڵ وان تـــابعین**

---

[1] - بروانە: گۆڤاری گزنگ، ژمارە ٣٤، لاپەرە ٣٦، ساڵی ٢٠٠٦.

لەسـەرەتای چلەکانی سـەدەی رابـردوو سـەفەری مـاڵی خـودای کـردووەو ئـەرکی حـەجی بەجێهێناوە، پاش گەڕانەوەی لە حـەج ئیـدی دانیشـتوانی دێـی بیرەسـپان نـاز نـاوی (مامۆسـتا حاجی مەلا) ی پێ دەبەخشن، لـە وەرزی هـاوینی سـاڵی ١٩٤٨ز مامۆسـتا حـاجی مـەلا نـەخۆش دەکەوێ، رۆژ لە دوای رۆژ باری تەندروستی ئاڵۆزتر بووە تا لە شەوی هەینی مـانگی ڕەمـەزان ڕێکەوتی (١٢ / ٧ / ١٩٤٨ز) لە تەمەنی ٦٥ ساڵیدا ماڵئاوایی لە دۆست و ئازیزانی کـردووە و بـە ئامادەبوونی دانیشتوانی دێی (کارێز و بیرالك و هەردوو بیرەسپان و قادر بـاغر و ڕۆژبـەیانی) و مامۆسـتایانی ئـایینی و کەسـایەتی و پیاومـاقوڵانی ناوچـەکەو لەسـەر وەسـیەتی خـۆی لـە گۆڕستانی وەکاشە (عکاشە) لە نزیك دێی یارمجە سەر بە ناحیەی پـردێ بـەخاك سـپێردراوە، ئارامگەی ئەم زاتە بۆتە زیارەتگای خەڵکێکی زۆر لە دانیشتوانی ناوچەکە کە هەمیشە دەچنە زیارەتی. لەمبارەیەوە شێخ وەهاب[1] بیرەسپان وتی: دایکم فەهیمە بۆی گێڕامەوە و وتـی: لـە گـەڵ ئەسمـەر لـە بـان خـانی لـە درەنگانێکی شـەودا خـەریکی شـیر دۆشـین بـووین، لـە ناکـاوە ئاسکێك هات بۆلای مامۆستا حاجی مەلا دەمی نا بە کوێچکەی (مامۆستا حاجی مەلا) پێکەوە وتووێژیان دەکرد.



**ئارامگای حاجی مەلا محەمەد نور**
**لە گۆڕستانی وەکاشە**

---

[1] - چاوپێکەوتنی: شێخ وەهاب کوڕی شێخ تەها کوڕی شێخ تاهیر. لە ڕێکەوتی (١٢ / ٦ / ٢٠١٧) گەڕەکی اسری ومفقودین – کەرکوك. ناوبراو لە ساڵی ١٩٤٩ لە گوندی (کارێز) لە دایکبوە. پیاوێکی دنیا دیدەو شاعیرێکی لێهاتووە، گەڵێ شیعری جوانی هەیە.......نووسەر

بۆ بەیانی مامۆستا حاجی مەلا فەرمووی: فەهیم ئەوە دوێنێ شەو ترسای؟ لە وەڵامدا نەخێر مامۆستا، پاشان فەرمووی: (دوو ڕۆژم ماوە لە دنیا بەجێ تان دێڵم)، دایکم وتی: پاش دوو ڕۆژ مامۆستا حاجی مەلا کۆچی دوایی کرد، وەسیەتی[٢] کرد پاش مردنم بنێرن بە دوای مەلا حەکیم[٣] بمشوات و لە گۆڕستانی (وەکاشە) بمنێژن.

هەروەها شێخ وەهاب لە زاری باوکی بۆی گێڕامەوەو وتی: پێش وەفاتی مامۆستا حاجی مەلا، باپیرم شێخ تاهیر لێی دەپرسێ مامۆستا بۆچی ئەو بەرەکەتە نادەی بە یەکێ لە کوڕەکانت؟ لە وەڵامدا مامۆستا دەڵێ: بانگی (ئەحمەد و نەجیب) م بۆ بکەن، شێخ وەهاب لە درێژەی قسەکانیدا وتی: باوکم لە مەجلیسی مامۆستا ئامادەبوو، مامۆستا حاجی مەلا دەستی ئەحمەدی کوڕی سێ جار گوشی، وتی: ئاخ ناوتم نا ئەحمەد بەڵام (ئەحەی)، پاشان دەستی نەجیب کوڕی سێ جار گوشی، وتی: ئاخ حەیف ئەم بەرەکەتە بدەم بەئێوە، بەداخەوە شێخ تاهیر هیچیان ناتوانن بیبەن سەر، (إنا لله وإنا إليه راجعون).

شێخ وەهاب لە درێژەی باسەکەیدا وتی: پاشی دوو ڕۆژ مامۆستا حاجی مەلا کۆچی دوایی کردو باوکم بە سواری ماین و وڵاخێکی لەگەڵدا دەبێت، بەرەو ماڵی مەلا حەکیم دەچێ بۆ گوندی (قەزنەفەر)، دوو ڕێگای هەبوو بۆ ناو گوند، ڕێگای چایخانەو ڕێگایەکیتر، من ڕێگای چایخانەم گرتە بەر تا چوومە ماڵی مەلا حەکیم، ژنەکەی وتی: لە ماڵ نیە ئەمشەو مەلا حەکیم نەخەوتووە، پێم وت: بۆچی؟ وتی: چاوی دەچووە خەو، ڕێك خەبەری دەبۆوە، منیش پێم وت: بۆ ناخەوی مەلا حەکیم؟ وتی: ژنەکە لە خەوما پێم دەڵێن: ( یەکێ لە

---

[٢] - شێخ وەهاب گێڕایەوە و وتی: مامۆستا حاجی مەلا پێش وەفاتی بە دایکم دەڵێ: فەهیمە تۆ لەبەر ئەوەی زۆر ئەرکت کێشاو و ماندوو بووی لەگەڵم دا، ئەم تاخم ددانەم بە ئەمانەت دەدەمێ و دەبێ زۆر ئاگاداری بیت، پاش وەفاتی مامۆستا، ئیدی ئەو تاخمە ددانە کەوتە لای دایکم و لەسەر وەسیەتی مامۆستا حاجی مەلا. بە ردەوام لەگەڵ خۆی هەڵی دەگرت و زۆر پارێزگاری لێ دەکرد و تا رووخانی دێهاتەکانی کوردستان لەلایەن ڕژێمی بەعسی بۆگەن، هەر مابوو، بەڵام لەوە بە دواوە فەوتاوەو لە ناوچووە. وەك لێی دەگێڕنەوە ئەو تاخمە ددانە بەرەکەت دار بووە، بۆ چەندین نەخۆشی تاقی کراوەتەوە وەکوو: (گرانەتا، لەرزووتا، نزۆکی، کۆکە ڕەشە، حەمل)، خەڵکی ناوچەکەو دەوروبەری خستوویانەتە نێو پەرداخێکی ئاو، ئاوەکەیان خواردووەو بە کارهێناوەو گەلێ سوودیان لێ بینیوە.

[٣] - ناوی تەواوی: مەلا حەکیم کوڕی عەبدولسەمەد کوڕی خدرە، لەساڵی ١٩١٠ لە گوندی دەرماناوەی گەورە لەدایکبوە، لەساڵی ١٩٣٣ ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، لە ١٩٣٧ تا ١٩٤٧ مەلای گوندی یارمجە بووە، لە ١٩٤٨ تا ١٩٦٣ مەلای قەزنەفەر بووە، لە سەر کوردایەتی خۆی و دکتۆر لەتیفی کوڕی و مەلا محەمەدی ئەمینی برای بۆ ماوەی ٦ مانگ لە بەندیخانە بەند دەکرین، لە ١٩٧١ تا ١٩٧٣ مەلای گوندی کەلوڕ بووە، لە ١٩٧٤ تا ١٩٨٨ وتارخوێنی مزگەوتی تەپپە و مزگەوت و تەکیەی شێخ باقی بووە، لە ڕێکەوتی (٢٣ / ٧ / ١٩٨٨) ماڵئاوایی لەجیهان کردووە، سەرچاوە: لە پەیجی مەلا ڕێبوار ساڵەیی... لە ڕێکەوتی (٢٢ / ١ / ٢٠١٧) ئەم بابەتە وەرگیراوە....نووسەر.

ئەولاد وەفاتی کردووە دەبێ بچی بیشۆی) و هەڵسە مەخەوە یەکێ دێت بە دواتا دوو ولاخی پێ دەبێت، شێخ وەهاب وتی، باوکم بە مەلا ژن دەڵێ: ئەی باشە دەبێ مەلا حەکیم لە کوێ بێ؟، مەلا ژن: پێی دەڵێ تۆ لە چ ڕێگایەك هاتی، پێم وت: لە ڕێگای چایخانەکەوە هاتم، مەلا ژن وتی: بڕۆ لە ڕێگاکەی تر وا لای ماڵی فلان کەس چاوەڕوانی تۆ دەکات، کاتێ چووم مەلا حەکیم لە چاوەڕوانی من بوو، ئەوە بوو بە یەکەوە هاتین بۆ گوندی (بیرەسپان) و مامۆستا حاجی مەلای شۆشت و کفنی کردو پاشان بەرەو گۆڕستانی وەکاشە (عکاشە) لە وێ بەخاك سپێردرا[1].!. ئەم زاتە سێ ژنی بووە: یەکەم ناوی: (جەمیلە کچی سەعید) کە خەڵکی شاری کۆیە بووە، لەم ژنە دوو کوڕو دوو کچی بووە بەناوەکانی: (ئەحمەد، محەمەد نەجیب، ئامینە، مەهجەبین). دووەم ناوی: (خەدیجە کچی مەلا سلێمان) کە خەڵکی دێی ئاوماڵ بووە، لەم ژنە یەك کچی بووە بەناوی: (حەبیبە). سێیەم ناوی: (فاتمە کچی مەحمود) ناسراو بە فەتوم، لەم ژنە منالی نەبووە.



مەلا حەکیم

[1] - شێخ حەسەن بۆی گێڕامەوەو وتی: دوای بەخاك سپاردنی مامۆستا حاجی مەلا. خالە نوری کە موئەزنی مەزگەوت و پیاوێکی بە تەمەن و بەڕێزی گوندی بیرەسپانی گەورە و خۆشەویستی مامۆستا بوو، سێ جار بە دەوری گۆڕی مامۆستا حاجی مەلا دەسورێ و لەبەر چاوی ئەو خەڵکە دەڵێ: حاجی مەلا تۆ ڕۆیشتی ڕەببی کوێرایم دابێ ئەگەر منیش لە دوای تۆ. لە یەك هەفتە زیاتر بمێنم، پاشان بە خزمانی بیرەسپان دەڵێ: ئێوە شاهێد بن من پاش هەفتەیەکی تر دەمرم و لێرە لە تەنیشت مامۆستاوە بمنێژن، خاڵە نوری دوای هەفتەیەك کۆچی دوایی دەکاو خەڵکی بیرەسپان وەسێتەکەیان بە جێهێناو لە تەنیشت مامۆستا حاجی مەلا بەخاکی دەسپێرن، چاوپێکەوتنی: شێخ حەسەن شێخ تاهیر شێخ شەریف بیرەسپان، لە ڕێکەوتی (٢٣ / ٧ / ٢٠١٦) شەوی یەکشەممە، تەپپە - کەرکوك......نووسەر.

# مەلا عەبدوڵڵا

ئەم زاتە سێیەم کوڕی مەلا ئەحمەدی کۆر بووە، پیاوێکی خواناس و هەڵکەوتوو بوو، لە ڕێگەی ژیانی دنیاو قیامەت نەسرەوتووە بۆ میوان و خزم و خۆشیان بە وێڵ و ماریفەت بوو، خاوەنی شان و شکۆ و غیرەت و بەخشندەیی و هەیبەت بوو، زۆر حەزی لە نان بدەیی و پیاوەتی و ڕێزی لە خەڵك گرتووە، بۆیە منیش ئەم چوارینەم بۆ نووسی:

**زمان شیرین و دەم بــەخەندە و نەجیب**

**سەخی دەروون و دڵپـــاك و حــەبیب**

**( مەلا عەبدوڵڵا ) وتاربێژی کۆڕو دیـوان**

**خۆشەویست بوو لــە نـــاو خزمان**

ناوی تەواوی: مەلا عەبدوڵڵا کوڕی مەلا ئەحمەدی کۆر کوڕی بابارەسوڵە، لەساڵی ١٨٨٦ز لە دێی ئۆمەر گومبەت لە دایکبوە، دایکی ناوی (خەدیجەکچی حاجی فەقێ مەحمودی کۆیی) یە، سەرەتا لای باوکی دەستی بە خوێندن کردووەو دواتر لەلای مەلاکانی ئەو سەردەمە خوێندوویەتی، ناوبراو مەلایەکی شارەزاو زیرەك و لێهاتوو بووە، هەروەها مرۆڤێکی کارامەو سەخی تەبیعەت و میوان دۆست و پیاوچاك و بەخشندە بووە.

لەمبارەیەوە: شێخ محەمەد شێخ نەجم بیرەسپان دەگێڕتەوەو دەڵێ: خەزورم جەوهەر حەمە ساڵح کە خەڵکی گوندی (خوڕخوڕ) ی سەر زێی بچوك سەرووی شارۆچکەی پردێ بوو، نەخۆش دەبێت و ئازارو گرێیەك لە ناوسکی پەیدا دەبێت، بۆ چارەسەری نەخۆشییەکەی سەردانی پزیشك دەکات، بەڵام بێ سوود دەبێت، لە ئەنجامدا لەماڵەوە چاوەڕوانی مردن دەکات، جا مەلا عەبدوڵڵا بۆ هەواڵ پرسین سەردانی ماڵی (جەوهەر حەمە ساڵح) دەکات لە گوندی ناوبراو، دواتر دەس بەسکی ناوبراو دەهێنێت و ئایەتی قورئانی بەسەردا دەخوێنێت و ورده ورده ناوسکی دەست بە قرمەقرم دەکات، پاش ماوەیەکی کەم دەچێتە سەر ئاو خوێن لە دامێنی دێتە خوار و ئیتر هەست دەکات گریکە لە ناوسکی نەماوەو دوای ماوەیەك چاك دەبێتەوە.!

د. جەمال محەمەد باجەلان بە خەلیفە عەبدوڵڵا ناوی دەباو دەڵێ: خەلیفە عەبدوڵڵا لەم دێیانە[1] مەلایەتی کردووە لەوانە: تاڵەبانی بچووك، تەکەڵتو، سماقەی شێخ بزێنی.

مەلا سەید عەبدوڵڵا دوا شوێنی مەلایەتی لە دێی سماقە[2] بووە، لەساڵی ١٩٤٣ز لە تەمەنی ٥٧ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی شێخ وەلی و لە دێی ناوبراو بەخاك سپێردراوە.

ئەم زاتە دوو ژنی هێناوە: یەکەم ناوی (تەمینە کچی سەعید محەمەد عەزیز مەسرەف) ە، خەڵکی شاری کەرکوك و دانیشتووی گەڕەکی زێوێ بووە، لەم ژنە دوو کچی بووە بە ناوەکانی: (حەلیمە، ڕابیعە).

دووەم ژنی ناوی (خورشیدە کچی خدر مەولود) ە، خەڵکی شاری کەرکوك و دانیشتووی گەڕەکی شاترلوو بووە، ناز ناوی (گەوە) بووە، لەم ژنە دوو کوڕی لێ بەجێماوە: (عەبدولحەمید، عەبدولەجید).



ئارامگای مەلا عەبدوڵڵا
لە گوندی سماقە

[1] - بڕوانە: ڕۆژنامەی تاك، ژمارە ١١، لاپەڕە ٥، ساڵی ٢٠٠٥.

[2] - سماقە دێیەکە نزیك قەرەناو لە بناری چیای خاڵخلانی سەر بەناوچەی شێخ بزێنی سەرووە.

# مامۆستا مەلا عەبدولحەمید



ناوی تەواوی: مەلا عەبدولحەمید کوڕی مەلا عەبدوڵڵا کوڕی مەلا ئەحمەدی کۆر کوڕی باباڕەسوڵە، دایکی ناوی (خورشیدە کچی خدر مەولود) ە، ناوبراو لەساڵی ۱۹۳۱ لە شاری کەرکوك لەدایکبوە، پاش فامکردنەوە دەستی داوەتە خوێندن و لە خزمەت مامی خۆی (حاجی مەلا محەمەد نور) دەرسی فەقێیەتی خوێندووە لە گوندی ئۆمەر گومبەت، پاشان بۆ بە دەستهێنانی زانیاری زیاتر، روودەکاتە شاری بەغدا و بۆ ماوەی (١٤) مانگ خوێندوویەتی بەڵام بەداخەوە ناوی مامۆستاکەی نەزانراوە، ناوبراو گەلێ کۆششی کردووەو دواگەڕانێکی کۆڵنەدەرانە لە شار و دێیەکانی کوردستان و پشکنینی گەرمێن و کوێستان، لە ئە نجامدا لە خزمەت (مەلا عەبدولڕەحمانی پارمجە) ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە.

ئەم زاتە وەك باوك و باپیرانی لە رێبازی تەسەوفدا بەدەر نەبووە و پیاویکی پیاوانە و سۆفییەکی لە خوداترس و هەق ویژو و رەوشت بەرز بووە، لیی دەگێرنەوە کەسێکی چاوتێرو سەخی تەبیعەت و ئارەزووی لە پیاوەتی و چاکە بووە، هەروەها کەمدەرامەتان و هەژارانی خۆش ویستووە، هەروەها رۆڵی کاریگەری بووە لە کاری خێر و سوڵح و مەسلەحەتدا.

واتە بە مەعنای کەلیمە پیاوێکی زاناو عاقڵ و هۆشیار بووە، ئاگاداری شەرعی پیرۆزی ئیسلام و شارەزایی لە زانیاری وەکو: (نەحو و سەرف و بەلاغە و مەنتق و فقەو تەفسیری قورئانی پیرۆز) دا بووە، هەروەها زانا بووە بە (عیلمی باتین) کە بریتیە لە تەسەوف بە یاسای شەریعەتی ئیسلام، مەلا عەبدولحەمید بۆ سوود وەرگرتن لە رێبازی پیرۆزی تەسەوف دەچێ بۆ شاری هەولێر و لە خزمەت (شێخ مستەفای هەولێر) تەمەسووك دەکات و لە خزمەتیا سلووك و ئادابی زیکرو فیکری بە جێهێناوە و پاشان لە سەر دەستی ئیجازەی تەریقەتی (نەقشبەندی) وەرگرتووە.

هەروەها دەستی باڵای بووە لە شیعر و ئەدەبدا و سوارچاکی مەیدانی زانست و هۆنینـەوەی شیعر بووە بە زمانەکانی: (کوردی و عەرەبی و تورکی و فارسی) گەڵێ نووسـین و دانـراوی بـە نرخـی لـە زانیارییـە جـۆراو جۆرەکانـدا هـەبووە، مـەخابن بـە هـۆی بـارودۆخی نالـەباری کوردستان ئەو شیعرو نووسراوانە هەمووی لە ناوچووە.

دەبێ ئـەوەش بڵێم مـەلا عەبدولحەمیـد لـە چـەن شـوێنك مەلایـەتی کـردووە لـە وانـە: لـە کەرکوك لە ساڵانی پەنجاکاندا جاروبار وتاری هەینی لە مزگـەوت و تەکیـەی (شـێخ محێـدینی کـەرکوك) خوێندۆتـەوە، هـەروەها لـە سـاڵانی حـەفتاکانی سـەدەی رابـردوو پێشـنوێژو وتـار خوێنی مزگەوتی (موحەمـەدی) بـووە لـە گـەڕەکی ساحەی تـەیاران (گاوڕبـاخی)، پاشـان لـەم گوندانەی کوردستان مەلایەتی کردووە لەوانە: (گەزوەشان، سێ قوچان، چەخە میرە، تاڵەبانی بچووك لـە تەفتـەق، دەلۆ سەرخاسـە لەناوچـەی شـوان)، هـەروەها لـە مـەخمور و قەسـران و دیبەگە مەلایەتی کردووە، بۆ دواجار لە گوندی مەلا ئۆمەر لەسەر ڕێگای شەقڵاوە پێشنوێژو وتارخوێنی مزگەوتی گوندی ناوبراو بووە.

بەڕێز کاك ئەحمەد کوڕی مەلا عەبدولحەمید لە بارەی بـاوکی ئەمـەی نووسـیوە و دەڵـێ: لـە ڕێکەوتی (١٠ / ٤ / ١٩٨٠) لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە حکومی ئیعدامی بۆ دەرچوو، لـەو بـەرواره لە ماڵ دەرچوو رووی کردە وڵاتی ئێران، لە وێش کۆماری ئیسلامی ئێران بەگەرمی پێشوازی لێ کـردووە، بـەڵام بـەڕێز کـاك مەسـعود بـارزانی ڕێگـری لـە ئێـران کـرد و نەیـدا بـە کۆمـاری ئیسلامی، لەلای خۆیان هێشتیانەوە و پلەی (قازی شۆرش) یان پێ بە خشی، بـەڵام بەداخـەوە لە ماوەیەکی کەم مەرگ ڕێگـای پێنـەداو لـە شاری نەغـەدا لـە گونـدی ڕاژان بـە نەخۆشـی دڵ راوەستان گیانی پاکی سپارد و لە ڕێـورەسمێکی پـڕ شـکۆدا لەلایـەن مەسـعود بـارزانی و پـارتی دیمکراتی کوردستان تەرمەکەی بەرەو گۆڕستانی گەورەی نەغەدە دوور لە کەس و کار و خاك و نیشتمان بەخاك سپێردرا، ئەوە ماوە بڵێم ئێستاش لەسەر پلەی خۆی بە شـەهید لـە قەڵـەم دراوە، موچەی شەهیدانەکەشی خانەوادەکەی وەری دەگرن کە بڕی (٥٠٠) هەزار دینارە.

نـاوبراو لـە دوای خـۆی پێـنج کـوڕی لێ بـە جێمـاوە بـەم ناوانـە: (ئەحمـەد، عەبـدوڵڵا، عەبدولکەریم، عەبدولقادر، عەبدولڕەزاق).

## مەلا عەبدولحەمید لە دیدی شێخ حوسێن بەرزنجی دا:

ساڵی پەنجاو هەشت و پەنجاو نۆ (مامۆستا مەلا حەمید) لە کەرکوك بوو، دەهاتە تەکیەو مزگەوتی (شێخ محی الدین کەرکوك) لە گەڕەکی ئیمام قاسم، پیاوێکی باڵا بەرزو چاکەت و پانتۆڵی لە بەر دەکرد، جارو باریش بەرگی کوردی و جامانی دەبەستە سەریەوە.

ئەو کات ماڵیان لە گەڕەکی ئیمام قاسم بوو، خۆی و برایەکی هەبوو ناوی عەبدولەجید بوو، دووبرا بون دایکیان لە ژیاندا بوو، لەو سەردەمە هیچیان ژنیان نەهێنابوو، مەلا عەبدولحەمید مەلایەکی زیرەك و رۆشنبیرو شاعیرێکی زۆر چاك بوو، جار جار وتاری هەینی لە مزگەوتی شێخ محی الدین دەخوێندەوە، بە تایبەت کاتێ مەلا شێخ عومەری پەڵکانە (عمر عصری) لەوێ نەبوایە[1].

لە یادمە جارێکیان مەلا شێخ عومەر لە دەشت بوو، ئەوە بوو مەلا حەمید وتارێکی ئامادە کرد و بردیە خزمەت شێخ عەبدولڕەحمان و پێی وت: دەبێ خۆت وتاری هەینی بخوێنیتەوە، جا جەنابی شێخ عەبدولڕەحمان نامەیەکی نووسی بۆ دەشت بۆ مەلا شێخ عومەر.

ئەمە دەقی نامەکەیەتی: (کاکە مەلا سلام و احترامم بۆ خۆتووماڵەوە، گەر بۆت نەکرا بێیتەوە بۆ کەرکوك قەیناکا، چونکە مەلا حەمید بۆ رۆژی جمعە خطبەی بۆم ترتیب کردە خۆم خطبە ئەخوێنم).

**ئیمزا**

**عبدالرحمن نجم الدین زادە**

---

[1] - مەلا شێخ عومەر کوڕی شێخ ساڵحی موجاهید کوڕی شێخ مەحمودی بەرزنجییەو ئەمیش لە نەوەی (شێخ محێدینی کەرکوك) ە. ناوبراو لەساڵی ١٩١٤ لە گوندی (پەڵکانە) ی سەر بە ناوچەی قەرەحەسەن چاوی بە ژیان هەڵهێناوە، بۆ خوێندن گەلێ کۆششی کردووە و لە خزمەت زاناکانی ئەو سەردەمە وەکو: (مەلا ئەحمەدی فەرقان و مەلا ڕەفیق و حاجی مەلا عومەری گومبەتی و مەلا مەجیدی قوتب و مەلا عەلادین) زانستە شەرعییەکانی خوێندووەو بەڵام بە هۆی نالەباری و کارو باری ماڵ نەیتوانیوە ئیجازەی مەلایەتی وەربگریت، مەلا شێخ عومەر مرۆڤێکی کۆمەڵایەتی و ئەدەب دۆست و خۆش نووس و شاعیرێکی هەڵکەوتوو بووە، نازناوی شیعری (عەسری) بۆ خۆی هەڵبژاردووە، لە ساڵی ١٩٦٧ ماڵئاوایی لە جیهان کردووە،،، بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ گۆڤاری بانە رۆژ، لاپەڕە ٢٣، ژمارە (١٠١) ی ساڵی ٢٠١٤.

حەقیقەت مەلا عەبدولحەمید خوێنەوار بوو، مەلای چاك بوو، زیرەك و بیرتیژ و قسەزان و خەتی زۆر خۆش بوو، هەروەها پیاوێکی سەخی تەبیعەت و قسەخۆش و گاڵتەچی بوو، زۆر دۆستی باوکم مەلا شێخ عومەر و شێخ عەبدولڕەحمانی خاڵم بوو[1]، زۆر جار من و ڕەحیمی دەعوەتی خواردنی دەکردین بۆ ماڵی خۆیان لە گەڕەکی ئیمام قاسم، بۆ چەن جارێك نانی نیوەڕۆمان لە ماڵی مەلا حەمید خواردووە، گەلێ ڕێزی لە من[2] و شێخ ڕەحیم کوڕی شێخ ئەمینی خاڵم دەگرت.

شیعرەکانی مەلا حەمید پڕ ماناو کاریگەر بوون، زۆربەی شیعرەکانی لە بارەی کۆمەڵایەتی و ڕەخنەو ئەدبیاتەوە بوو، هەروەها دەستی باڵای لە شیعری سیاسیی هەبوو، چەپ ڕەو بوو، وابزانم ئەندامی حیزبی شیوعی عێراقی بوو، زۆر زەعیم عەبدولکەریم قاسمی خۆش دەویست، لەمبارەیەوە شیعرێکی نایابی ڕێکخستبوو کە بریتی بوو لە سی و چوار (٣٤) بەیت، لە ستایشی ئەوا وتبوی، جا بەچەپڵەوە دوو سێ کەسی دەنگ خۆش دەیان وت و هەندێ جاریش هەڵپەرکێ دەسی پێ دەکردو بە ئاوازێکی تایبەتی خۆش دەیان وت، سەرەتاکەی بەم شیعرەوە دەسی پێ دەکرد:

**یــــــاربنا یـــــــاحلیم هەر تۆی خودای عظیم**

**حیفظی بکــەی یارەبی سەرداری گەلمان زەعیــم**

کۆتایەکەشی بەم جۆرە تەواو دەبوو:

**سی و چوار شیعری تەواوە شیرینە وەکو شکراوە**

**لە بۆ کەسێ دانراوە کــوڕی قـــاسم شێر کەریم**

---

[1] – شێخ عەبدولڕەحمان کوڕی شێخ نەجمەدین (صابری) و لە نەوەی شێخ مەحمودی قوتبی بەرزنجیە. ناوبراو لەساڵی ١٩١٧لە گوندی (شۆرجە) ی قە ڕەحەسەن لە دایکبوە. لە خزمەت کاکی خۆی مەلا شێخ محەمەد و حاجی مەلا عومەری گومبەتی و مەلا ڕەفیق زانستە شەرعییەکانی خوێندووە، بەڵام مۆڵەتی مەلایەتی وەرنەگرتووە، لە خزمەت باوکی تەریقەتی قادری وەر گرتووە. هەروەها لە خزمەت شێخ محەمەدی قادر کەرەم تەریقەتی قادری وەرگرتووە. ئەم مرۆڤە شاسواری سەردەمی خۆی بوو، خاوەن مزگەوت و تەکیە و دیوەخان بوو. سەخی تەبیعەت و خواناس و مرۆڤ دۆست بوو، شێخێکی ڕاستگۆ و دنیا نەویست بوو. لە ڕێکەوتی (١ / ١ / ١٩٧٨) لە گوندی شۆرجە بەخاك سپێردراوە. بڕوانە:........ گۆڤاری کرکوك الیوم، ژمارە ٢٦، لاپەڕە ٩٣، ساڵی ٢٠١٦.

[2] - ئەم زانیارییەم لە بەڕێز شێخ حوسێن بەرزنجی لە ڕۆژی (٣٠ / ١٢ / ٢٠١٦) وەرگرتووە. گەڕەکی ئیسکانی تازە، کەرکوك.....نووسەر.

# مەلا فاتیح



ناوی تەواوی: فاتیح ناسراو بە (مەلا فاتیح کوڕی مەلا نور محەمەد کوڕی مەلا ئەحمەدی کۆر کوڕی بابارەسوڵە) [1] ، ناوبراو لەساڵی (١٩٠١) لە زێدی باوك و باپیری لە گوندی ئۆمەر گومبەت لە بنەماڵەیەکی ئایینی و نیشتمان پەروەر چاوی بە سروشتی جوانی کوردستان هەڵهێناوە، دایکی ناوی (فاتمە کچی مەحمود سورچی) ە.

ئەم کەڵە پیاوە لە خزمەت باوکی و مامی خوێندوویەتی، وەك لێی دەگێڕنەوە: پیاوێکی بالا بەرزو قۆزو جوان بووە، کەسێکی بە دین و خواناس و نفوس پاك و دوعا گیرا بووە، هەروەها مرۆڤێکی کورد پەروەر و دڵسۆزی خاك و نیشتمان بووە، یەکێ بوو لە دۆست و ئازیزانی سەرکردەو قارەمانی گەلی کورد شەهید عەلی عەسکەری، لە سەرەتای سالانی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو پەیوەندی بە شۆڕشی کورد کردووە، بە لێهاتووی و قارەمانی خۆی، دەگرێ بە (حاکم) شۆڕش لە بنکەی سەعید خەلیل لە گڵنجاخ کە لە نزیك گوندی (گۆپتەپە) بووە.

لە شۆڕشی نوێ دەستی بالا بووەو زۆریش تێکۆشاوە، شەیدای کوردایەتی و بەدیهێنانی ئاواتەکانی گەلی کورد بووە، لەساڵی (١٩٩٨) لە تەمەنی ٩٧ ساڵیدا ماڵئاوایی لە جیهان کردووەو لە شاری هەولێر بەخاك سپێردراوە.

لە دوای خۆی چوار کوڕی لێ بەجێماوە بە ناوەکانی: (عەزیز، ئەحمەد، محەمەد، سابیر).

١ ٢ ٣ ٤

---

[1] - کۆی ئەم زانیارییەم لە کاك محەمەد کوڕی مەلا فاتیح وەرگرتووە، لە ڕێکەوتی (١٨ / ١ / ٢٠١٧) کەرکوك.....نووسەر.

# خانەقای مەلا عومەر ئۆمەر گومبەتی

شوێنی ئەم خانەقایە دەکەوێتە گەڕەکی (زێویەی ئیمام قاسم) لە شاری کەرکوک، لە سەرەتای دامەزراندنییەوە خانەقاکە خزمەتێکی زۆری بە خەڵکی شاری کەرکوک گەیاندووەو خوێندنگەیەك بووە بۆ بەشێکی زۆر لە مامۆستایانی ئایینی شاری کەرکوك و شارەکانی تری کوردستان و مۆڵەتی وتاربێژی بە چەندین مامۆستای ئایینی ناودار بەخشیوە. شایانی باسە ئەوەی لە خانەقاکە ئەنجامدراوە زیاتر کاری وانە وتنەوەو پێدانی مۆڵەتی مەلایەتی بووەو بەهۆی ئەوەی خانەقاکە لەلایەن حکومەتە یەك لە دوای یەکەکانی عێراقەوە چاودێری لەسەر بووە نەتوانراوە زۆر کاری تێدا ئەنجامبدرێت.

ئەم خانەقایە: لەساڵی (١٩٦٦) ی زاینی خاپور کراو هیچ ئاسەوارێکی نەما، بەڵام دواتر مزگەوتەکەی نۆژەن کرایەوە و بەهۆی سیاسەتی تەعریبەوە کە ڕێگە نادرا ناوی کوردی لە شوێنە گشتییەکان بنرێت، ناونرا مزگەوتی (قیس بن سابت) و دوایین نۆژەنکردنەوەش کە بەخۆی بینی لەسەردەمی کابینەی پێنجەمی حکومەتی هەرێم بوو، بە فەرمانی (نێچرڤان بارزانی) سەرۆکی ئەوکاتەی حکومەتی هەرێمی کوردستان خانەقاکە نوێژەن کرایەوەو ئێستاش بنەماڵەکە سەرپەرشتی مزگەوت و خانەقاکە دەکەن.



خانەقای مەلا عومەر ئۆمەر گومبەتی – کەرکوك – زێویەی ئیمام قاسم

# کورتەیەك لە ژیاننامەی

# حاجی مەلا عومەر ئۆمەر گومبەتی

ناوی تەواوی: مەلا عومەر کوڕی مەلا ساڵح کوڕی مەلا عەبدوڵلا کوڕی حاجی مەلا ئیبراهیم کوڕی مەلا ئەبوبەکر کوڕی مەلا نورەدین کە لە نەوەی مەلا هاشمی کوڕی جومعە بووە، ئەم زانا پایەدارە لە بنچینەی دەربەندییەوە لە بەرەبابی شەلەوەندییەوە هەردەم بە ئۆمەر گومبەت خۆی هەڵداوەو لە شاری کەرکوك لە بنەماڵەیەکی مەلازادە لەساڵی ١٨٨٢ هاتۆتە دنیاوە، لە دوای مردنی مەلا عومەری مامی کە کوڕی مەلا عەبدوڵلای کوڕی مەلا ئیبراهیمی ئۆمەر گومبەتیە، هەر ئەو کاتە ناوی ئەمیان ناوە بە (عومەر) بە ناوی مامیەوە هەروەك ناوبراوە بە عومەری دووەم.

لە خانەقای مەلا عومەری گومبەتی قورئانی پیرۆزی خوێندووە لەگەڵ هەندێك لە کتێبەکانی پلەی قوتابیەتی لەلای باوکی و (مەلا سدیقی) کاکی وەك لەو کاتەندا مەلا سدیق ئیمامی خانەقاکەیان بووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە برا گەورەی بوو، ئەوسا مەلا عومەر بەپێی شێوەی خوێندنی فەقێیەتی لە شارەکاندا بۆ پلەی (سوختەیی) و (مقدمات) چۆتە مەدرەسەکانی و لەخزمەتی مامۆستا بە نرخەکان گەلێك بەهرەی وەرگرتووە.

هەروەك لە خوێندنگای ئۆمەر گومەت و سێگردکان و ئاوماڵ و هەولێرو خۆشناو و دەشتی دزەیی وپشدەرو سلێمانی و کۆیەو پردێ و قادر کەرەم و بیارەی شەریف خوێندوویەتی، لە کاتێکدا کە لەدێی کەڵکەسماق [1] خەریك خوێندن بووە، نامەی نەخۆشی (مەلا سدیق) ی کاکی پێ گەیشتووە و هاتۆتەوە کەرکوك بۆلای، بەڵام پاش چەند ڕۆژێك کاکی وەفاتی کردووە لەو ڕۆژەدا، وەك لە کەرکوك شەڕی ئەرمەنی قەوماوە کە دەکاتە ساڵی (١٩٢٤)، ئەو کاتە مەلا عومەر لەسەر خانەقاکەیان بە ناچاری دادەنیشێت.

---

[1] – کەڵکەسماق گوندێکە سەر بە شارۆچکەی دوکان، لە ساڵی ١٩٢٣ز مزگەوتی کەڵکەسماق لەسەر دەستی مامە ڕەزای حاجی شێخ مستەفای عەسکەرو بە هاوکاری خەڵکی ناوچەکە ئەو مزگەوتە دامەزراوەو بەدیان فەقێ لە حوجرەی مزگەوتی کەڵکەسماق خوێندوویانەو پێگەیشتوون. ڕۆڵی خانەقاکانی باشوری کوردستان، دەستنوس......نووسەر.

لەپاش ئەو هەموو ئەرکە، ئەم (مقام) ە دەخاتە سەر ئەستۆی خۆی چونکە لەو کاتەدا لەم کەسی تر نەبووە لە ناو بنەماڵەکەیان بۆ هەڵگرتنی ئەم ئەرکە میراتییە.

لەمبارەیەوە مەلامحەمەد ساڵح کوڕی مەلا عومەر دەڵێ: هەموو کات باوکی خوالێخۆش بووم بۆمانی باس دەکرد و دەیگوت: لەگەڵ هەلگرتنی باری خانەقاکەش، هەر بەردەوام بووم لەسەر خوێندنەکەم بەجۆرێك وا هەموو رۆژێك بەیانیان لە دوای نوێژ دەچوومە مزگەوتی (حاجی ئەحمەد ئاغا) بۆ دەرز خوێندن لە خزمەتی مامۆستا (مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی کوڕی حاجی عەبدولوەهاب سیامەنسوری، دوای دەرز خوێندنم دەگەڕامەوە خانەقای خۆمان. ئەوجا لێرە دەرسم ئەدا بە فەقێکانم لەگەڵ ئەمشدا، ئەرکی ئیمامەو کاروباری ئەم مەقامە هەر لەسەرم بوو، هەر بەم جۆرە خوێندم تا مامۆستا مەلا عەلی چووە ڕەحمەتی خوای گەورە، ئەوجا بۆ ماوەیەکی دوو مانگی چوومە سلێمانی و لە خانەقای (مەولانا خالید نەقشبەندی) لە خزمەتی مامۆستا (شێخ عومەری قەرەداغ) ی هەندێك دەرسی ئایینی و (فلکیات) م خوێند، هەر وەك سەفەرێکمان کرد پێکەوە بۆ بیارەی شەریف[1].

ئەمجا گەڕامەوە بۆ کەرکوك بۆ سەرپەرشتی خانەقاکەمان، بەڵام هەر بەردەوام بووم لەسەر خوێندنەکەم دەرزم دەخوێند لە خزمەتی مامۆستا (مەلا ناسیح مودەڕیس گەڕاوی کوڕی مەلا محەمەد ئەفەندی ئەللامع) تا وەکو ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە لە خزمەتی لە رۆژی هەینی لە ٢٢ی ذی الحجە ساڵی (١٣٤٨ ك – ١٩٢٩ز) دا.

مامۆستا مەلا محەمەد ساڵح [2] لە درێژەی باسەکەیدا دەڵێ: هەرچەند باوکم بە ناوی پیرۆزی پیت و بەرەکەت ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە لە خزمەتی ئەم خوالێخۆش بووانەش، کە بریتی بوون لەم مامۆستایانە وەك: (شێخ عومەر قەرەداغی لە سلێمانی و مەلا ڕەزای واعیز لە کەرکوك و سەید ساڵح شەتا لە (مەککەی پیرۆز)، بەڵام تەنها هەر کۆپی ئیجازە نامەکەی مەلا ناسایح لەبەر دەستمانە، هەروەك ئیجازەی تەریقەتی (قادری) وەرگرتووە لە خزمەتی (شێخ عەبدولڕەحمان بریفکان) ی شێخی تەریقەتی قادری لە

---

[1] - خانەقاو مەدرەسەی بیارە لەساڵی (١٣٠٧ك- ١٨٨٩ز) لەسەر دەستی شێخ عومەر زیائەدین نەقشبەندی دامەزراوە، بەسەدان بەڵکو بەهەزاران لە قوتابی و فەقێ و زانای ئایینی لەم خانەقایە ئیجازەی مەلایەتیان وەرگرتووەو هاوتای زانکۆی ئەزهەرە لە وڵاتی میسر. سەرچاوەی پێشوو خانەقاکانی باشووری کوردستان، دەستنوس......نووسەر.

[2] - بڕوانە: گۆڤاری کەرکوك، ژمارە ٤، لاپەڕە ٩٥، ٩٦، ساڵی ٢٠٠٩.

بریفکان، کردوویەتی بە خەلیفەی خۆی بۆ ئیرشاد لە کەرکوك، هەروەك پێش تر باسمکرد چۆتە بیارەی بەنرخ لەوێ تەریقەتی نەقشبەندی لە خزمەتی (شێخ عەلائەدینی بیارە) وەرگرتووە.

مامۆستا مەلا عومەر لە (١ / ٥ / ١٩٣٠) بە مودەڕیس لە مەدرەسەی (مەحمودی خاڵ) لە قەڵای کەرکوك، بەشێوەی (وکیل) لە باتی مەلا عەبدولرەحمانی کوڕی مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی، چونکە ئەو باوکی لەوێ مامۆستا بوو وەك چووە ڕەحمەتی پەروەردگار، خۆیشی هێشتا تەمەنی قانونی لە (١٨) ساڵ کەمتر بوو، بەڵام دوای ئەوەی کە گەیشتە ئەم تەمەنە.

ئیدی مەلا عومەر بە مودەڕیس (اصالة) هەر لە مەدرەسەی مەحمود خاڵ لە (٢١ / ٦ / ١٩٣٤) شوێنی ئەم مەدرەسەیە لە ناو مزگەوتی (مەیدان) بووە، پاش چەند ساڵێك ئەم مەدرەسەیە لەگەڵ مەدرەسەی (شاە غازی) کە لەناو مزگەوتی (ئولو جامع) بوو هەر لە قەڵای کەرکوکدا هەردووکیان لێك دران و مەدرەسەیەکیان لێ پێك هات بە ناوی (المدرسة العلمیة الدینیة المنظمة بکرکوك) بینایەکی بۆ دروست کرا لە ناو حەوشەی (ئولو جامع).

دوای شۆڕشی (١٤ی تەموزی ١٩٥٨) هەندێك گۆڕینی تر کرا لە سستەمی ئەم مەدرەسەیە، پاشان ناوەکەیان گۆڕی بۆ (المعهد الاسلامي في كركوك) ، خوالێخۆشبوو مەلا عومەر بەردەوام بوو لەسەر وانە وتنەوە لەم (معهدە) تا (٣ / ٣ / ١٩٦٥)، دەبێ ئەمەش بزانین کە مەلا عومەر لەگەڵ دامەزرانی لەم مەدرەسەیە، لە هەمان کاتشدا بە مودەڕیس لە (المدرسة الدینیة الملحقة بالمعابد) لە مزگەوتی (ئیمام قاسم) کاری خۆی ئەنجامداوە.

هەروەها مەلا محەمەد ساڵح لە بارەی مەلا عومەر دەڵێ: باوکم بە درێژایی ساڵەکان لە دانی بەیانیاندا دەرزی دەوتەوە لە (المعهد الاسلامي)، دواتر دانی نیوەڕۆ دەرزی ئەوتەوە لە مزگەوتی (ئیمام قاسم)، دوای ئەمە کاتێك کە دەهاتەوە بۆ ماڵەوە نانی نیوەڕۆی دەخوارد یەك سەر دەهاتە خانەقای خۆمان و هەر لەوێ وانەی ئەدا بە فەقێکانی، لەگەڵ فەقێکانی مزگەوتی (دڵی باش) کە لە کۆندا بە مزگەوتی (مەلا ئەمینە گردە) ناسراو بوو، لەگەڵ مزگەوتی (ئەحمەدە کوردە) کە لە ناو زێویەی ژووروە، لەگەڵ فەقێکانی مزگەوتی (تۆفیق مەلا قادر) و (خانەقای شێخ خدر) وانەی بە هەمووان ئەدا، بەڕاستی جێگەی سەرسوڕمان بوو چۆن توانای هەبوو؟!... چەند توانای هەبوو.

مەلا عومەر بۆ ماوەی چەند ساڵ ئاوها ڕای بوارد هیچ کاتێ حەسانەوەی نەبوو جگە لە خەمی میوانی خانەقاکەش کە هەر لەسەر شانی بوو، لەگەڵ ئەمەشدا کە بەدەستی خۆی خزمەتی میوانی دەکردو خواردنی بۆ دائەنان و بەڕێشی دەکردن.

دەبێ ئەمەش بزانین مەلا عومەر لە (٩ / ١٠ / ١٩٤٧) لە مزگەوتی (ئیمام قاسم) بە ئیمام و خەتیب دامەزراوە، لەو کاتەدا هەموو وەزیفەکانی لە ئیمام قاسم کۆکرایەوەو پەپێی (قانون توحید الجهات الرسمیە) هەروەکو لە دوای مردنی مامۆستا (مەلا ناسیح) لەساڵی (١٣٥٩ ك – ١٩٤٠)، مەلا عومەر بە (واعیز) داندرا لە مزگەوتی (نائیب) پاش ماوەی چەند ساڵێك ئەو کاتە وەعزەکەشی هەر دەگواستەوە بۆ مزگەوتی (ئیمام قاسم) ئیدی لێرەدا بوو بە ئیمام و خەتیب و مودەڕیس و واعیز، لەگەڵ ئەم (وەزیفە) پیرۆزانەشدا خوالێخۆشبوو ئەندام بوو لە(المجلس العلمي في أوقاف كركوك)، بەم شێوە کاری وەزیفەو ژیانی دنیایی بەسەر بردووە.

مەلا عومەر لە کاتی نوێژەکاندا هات و چۆی دەکرد لە خانەقای خۆیان بۆ مزگەوتی (ئیمام قاسم) بۆ ئیمامەتەکەی هەر ئاوها ژیا ئەوەندە کە توانای هەبوو ئەم ئەرکە دینیانەی سەر شانی بە تەواوی بەجێ بهێنێ، لە ڕۆژی (٣ / ٣ / ١٩٦٥) لە دوایی ژیانیدا تووشی (شەلەل) بوو، لەبەر ئەوەی کە توانای دەرچوونە دەروەی نەما لەماڵەوە مایەوە، مەلا عومەر داوای لە ئەوقاف کرد کە خانەنشین بکرێ، تا ماوەیەك ئەوقاف داوای لێ کرد وەزیفەکەی هەر بمێنێ، بەڵام مەلا عومەر ڕازی نەبوو بەم شێوەیە چونکە باوەڕی وابوو مووچەکەی حەرام دەبێت، بەم جۆرە وەزیفەیە لەبەر ئەوەی بە خۆی توانای نەمابوو هەستێ بەو ئەرکە دینیانەی لە ئەستۆیەتی.

لەمبارەیەوە مەلا محەمەد ساڵح[1] کوڕی مەلا عومەر دەڵێ: پاش چەند هەوڵێکی زۆر لەلایەن باوکمەوە بۆ جێبەجێ کردنی داواکەی، ئەوکاتە دائیرەی ئەوقاف بە ناچاری (احالە) یان کرد بۆ خانەنشینی لەو مێژووەی سەرەوەدا، ئەوجا باوکم لە ماڵەوە بەو نەخۆشییەوە مایەوە، تا لەرۆژی سێشەممە ڕێکەوتی (١٠ / ٦ / ١٩٦٩) لە تەمەنی (٨٧) ساڵیدا چووە ڕەحمەتی پەروەردگار.

مەلا عومەر یەکێك بووە لەو کەسانەی پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ شێخ مەحمودی حەفیدو مەلا مستەفای بارزانیدا هەبووە.

---

[1] – سەرچاوەی پێشوو، گۆڤاری کەرکوك لاپەڕە ٩٨، ٩٩.

ناوبراو بەهۆی پەیوەندیەکەی لەگەڵ مەلا مستەفادا، لە دوا ساتەکانی تەمەنیدا فەرمانی دەستگیرکردنی لەلایەن حکومەتی ئەو سەردەمەی عێراقەوە بۆ دەرکرا، بەڵام بەهۆی ئەوەی نەخۆش بوو لەماڵەکەی خۆی خرایە ژێر (الاقامە الجبریە) وە و لە کاتی بەسەر بردنی ماوەی سزاکەی لە ماڵەکەی خۆیدا کۆچی دوایی کردو بەئامادەبوونی زانایانی ئایینی و فەقێکانی و پیاوماقوڵانی شاری کەرکوك، تەرمی پیرۆزی لە گۆڕستانی (شێخ محێدینی[٢] کەرکوك) بەخاکی دەسپێرن.



**مامۆستا حاجی مەلا عومەر ئۆمەر گومبەتی**

[٢] – شێخ محێدین کوڕی شێخ حەسەنی گلەزەردە کوڕی شێخ محەمەد نۆدێ کوڕی شێخ عەلی وەندەرێنە کوڕی شێخ بابارەسوڵی بەرزنجیە، لەساڵی ١٧٢٠ز لە دێی گلەزەردە لەدایکبوە، ئەم زاتە یەکێ بووە لە پیاوچاکان و زانایەکی بەناوبانگی سەردەمی خۆی بووە، هەروەها لەبارەی تەسەوفەوە سالیکێکی سالارو پیاوێکی دامەزراو هۆشیار بووەو لەڕێبازی تەریقەتیشدا زۆر بایەخی بەڕێبازەکەی داوەو لە خزمەتی مامی خۆی کە شێخ ئیسماعیلی ولیانیە تەریقەتی (قادری) وەرگرتووە. کاتێ گەیوەتە پلەی ئیرشاد تەربییەتی گەلێ کەس کردووەو زۆر سوود بەخش بووە بۆ موسڵمانان، تا لەساڵی ١٧٧٩ز کۆچی دوایی کردووەو لەنزیك تەکیەکەی خۆیدا بەخاك سپێردراوە............بڕوانە: سیروان سەرگەڵوویی، ساداتی بەرزنجە، ژیاننامەی پیاوچاکان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٩١، ساڵی ٢٠١٤.

**حاجی مەلا عومەر زانایەکی بەناوبانگی سەردەمی خۆی بوو، بەدرێژایی تەمەنی وانەی ئایینی وتووەتەوە و چەندین زانای ئایینی پێگەیاندووەو مۆڵەتی مەلایەتی پێداون لەوانە:-**

١- حاجی مەلا عەبدوڵڵای بەردەسپی، لەساڵی (١٣٥٨ك – ١٩٣٩ز) ئیجازەی وەرگرتووە.

٢- مەلا ساڵحی دەرماناوی گەورە، لەساڵی (١٣٥٨ك – ١٩٣٩ز) ئیجازەی وەرگرتووە.

٣- حاجی مەلا محەمەد ئەمین زەنگەنە، لەساڵی (١٣٥٩ك -١٩٤٠ز) ئیجازەی وەرگرتووە.

٤- مەلا سەید عەبدولقادری قرشاغلوی، لەساڵی ( ١٣٥٩ك – ١٩٤٠ز) ئیجازەی وەرگرتووە.

٥- مەلا حەسەن دەروێش عەلی، لەساڵی (١٣٥٩ك – ١٩٤٠ز) ئیجازەی وەرگرتووە.

٦- مەلا محەمەد مەلا عەبدوڵڵای چەمکی، لەساڵی (١٣٦٠ك – ١٩٤١ز) ئیجازەی وەرگرتووە.

٧- مەلا محەمەدی مامیلی، لە ساڵی (١٣٦٤ك – ١٩٤٤ز) ئیجازەی وەرگرتووە.

٨- مەلا عەلی محەمەد ئەمین، لە ساڵی (١٣٦٨ك – ١٩٤٨ز) ئیجازەی وەرگرتووە.

٩- مەلا عەبدوڵڵای مەلا قادری سێگردکان، لەساڵی (١٣٦٨ك – ١٩٤٨ز) ئیجازەی وەرگرتووە.

١٠- مەلا سەید حوسێن سەید محەمەد ئەمین قوڵتەپەیی، لەساڵی (١٣٦٨ك – ١٩٤٨ز) ئیجازەی وەرگرتووە.

١١ - حاجی مەلا ئیبراهیم گردلانکەیی، لەساڵی (١٣٦٩ك – ١٩٤٩ز) ئیجازەی وەرگرتووە.

١٢- مەلا حەسەن مەنگۆڕی، لەساڵی (١٣٧٠ك – ١٩٥٠ز) ئیجازەی وەرگرتووە.

١٣- مەلا حەبیب دوبز، لەساڵی (١٣٧١ك – ١٩٥١ز) ئیجازەی وەرگرتووە.

١٤- مەلا محەمەد دەرماناوی گەورە، لەساڵی (١٣٧٣ك – ١٩٥٣ز) ئیجازەی وەرگرتووە.

١٥- مەلا سەید عەبدولڕەحمان قزقلعەیی، لەساڵی (١٣٧٥ك – ١٩٥٥ز) ئیجازەی وەرگرتووە.

١٦- مەلا محەمەد ساڵح مەلا عومەر گومبەتی، لە ١٠ / ٩ / ١٩٥٥ز ئیجازەی وەرگرتووە.

١٧- مەلا شێخ تەهای حەساری گەورە، لە ساڵی (١٣٧٦ك – ١٩٥٦ز) ئیجازەی وەرگرتووە.

١٨- مەلا عەبدوڵڵای قوڵتەپەیی، لەساڵی (١٣٧٦ك – ١٩٥٦ز) ئیجازەی وەرگرتووە.

١٩- مەلا ئەحمەد مەلا شەریف ئەفەندی، لەساڵی (١٣٨٧ك – ١٩٦٧ز) ئیجازەی وەرگرتووە، ئەمە دوا ئیجازەیە لەلایەن حاجی مەلا عومەری گومبەتی دراوە، چونکە لەدوای ئەم مێژووەی سەرەوە زۆری پێ نەچووە لە جیهان دەرچووە.

**پە پێی سەرچاوە مێژووییەکان بنەماڵەی مەلا عومەری گومبەتی چەندین کەسایەتی ناوداری تێدا هەڵکەوتووە[1] کە لە بواری ئاییندا شوێن دەستیان دیارە لەوانە:**

مەلا ئەحمەدی کوڕی ئیبراهیم بووە، ناوبراو هاوسەری خوشکی (حاجی قادری کۆیی) بووەولە قەڵای شاری کەرکوک بە خاك سپێردراوە.

★- مەلا عەلی کوڕی محەمەد کوڕی ئیسماعیل یەکێکی ترە لە کەسایەتییە ناسراوەکانی بنەماڵەکە و یەکێك بووە لە زانا بەناوبانگەکانی سەردەمی خۆی و چەند دەستنوسێکی هەیە کە تا ئێستا بەشێك لە دەستنوسەکانی ماون.

★- مەلا دەروێش کوڕی ئیبراهیم کوڕی فەقێ دەروێش یەکێکی ترە لە کەسایەتییە ناودارەکانی بنەماڵەی عومەر گومبەتی، کە شان بە شانی زانا ئاینییەکانی کەرکوك لە بواری ئایندا خزمەتی کردووە.

★- مەلا عەبدولڕەحمان کوڕی مەلا ساڵح کوڕی مەلا عەبدوڵڵا بووە، ناوبراو برای مەلا عومەری گومبەتی بچوك بووەو خەڵکی ناوچەکە باس لە پیاوچاکی و کارە باشەکانی دەکەن.

★- مەلا سدیق کە برای مەلا عومەری گومبەتییە، هەرچەندە دەستنوسی نەبووە، بەڵام لای خەڵکی گەڕەکی ئیمام قاسم ناوبانگی هەیە.

★- مەلا عەبدولقادر کوڕی مەلا عومەر گومبەتی کە دەرچووی پەیمانگای پێگەیاندنی مامۆستایانی تەواو کردووە، بە هەمان شێوە بۆ ماوەی ساڵانێك سەرپەرشتی خانەقاکەی کردووەو وەك پێشنوێژ لە مزگەوت و خانەقاکە کاری کردووە، ناوبراو یەکێ بووە لەو سێ مامۆستایەی کە لە کەرکوك ناوبانگیان هەبووە لەگەڵ مامۆستا رەئوف و مامۆستا شێرزاد جەباری لە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان بوون لە کەرکوك و لە ساڵی (١٩٨٧) لە زیندانی ئەبوغرێب لە بەغدا لەگەڵ هاوڕێکانی لەلایەن جەلادەکانی بەعس لە سێدارە دراو لە گۆڕستانی (شێخ محێدینی کەرکوك) بەخاك سێردراوە.

---

[1] — بروانە: ڕۆژنامەی هەواڵ، ژمارە ٥٠٠، لاپەڕە ١٥، ساڵی ٢٠١٢

# مەلا محەمەد ساڵح ئۆمەر گومبەت



لە چاوپێکەوتنێکیدا مامۆستا مەلا محەمەد ساڵح لە گەڵ گۆڤاری کەرکوك[1] وا لە باس ژیاننامەی خۆی دەکات: ئەمن ناوم محەمەد ساڵحەو کوڕی حاجی مەلا عومەری کوڕی مەلا ساڵحی کوڕی مەلا عەبدوڵڵای کوڕی حاجی مەلا ئیبراهیمی کوڕی مەلا ئەبوبەکری کوڕی مەلا نورەدینم. بنچینە و بنەڕەتم دەربەندییەو لە بەرەبابی شەلەوەندیم و لە (٨ / ١٢ / ١٣٤٤) ی کۆچی، بەرامبەر بە ساڵی ١٩٢٥ زاینی لە ڕۆژی شەممە لە کاتی نوێژی عەسردا لە گەڕەکی (ئیمام قاسم) لە شاری کەرکوکی خۆشەویست هاتوومەتە دنیاوە، لەم گەڕەکە گەورە بوومە، لەگەڵ ئەمەشدا من خۆم هەر بە عومەر گنبدی (ئۆمەر گومبەت) هەڵئەدەم شانازیی بە ئەوێوە دەکەم، چونکە عومەر گنبد جێ و شوێنی بنچینە و باپیرانمانە.

**لە بارەی خوێندنەوە:**

لە پلەی "قوتابیەتی" قورئانی پیرۆزم خوێند لە مزگەوتی (دەللی باش) لای مامۆستا مەلا رەفیق، هەروەها لە خانەقای ( ئۆمەر گومبەت)ی لەلای فەقێکانی باوکم هەندێك کتێبم خوێند، هەر وەك باوکم خوا پاداشتی بداتەوە دوو کەرەت هەموو قورئانی لە گەڵما دەورکردەوە: لە ئەوەڵ هەتا کۆتایی. لە پلەی "سوختەیی" لەساڵی (١٣٥٨) ی کۆچی بە رامبەر بە ساڵی (١٩٣٩) زاینی (سعدالله الصغیرم) خوێند لە دێی چیمەنی (سەید عەباس) کە نزیکەی ١٠ کیلۆمەتر لە کەرکوکەوە دوورە، لە مەدرەسەی مامۆستا مەلا عەبدوڵڵای بەردە سپیی لە خزمەتی مامۆستا مەلا عەبدولقادری کوڕی مامۆستا حاجی مەلا محەمەد ئەمینی سێگردکانی کە "مستعد" بوو لەو کاتەدا. ئەوجا گەڕامەوە کەرکوك پاش ماوەیەك وەرگیرام لە (المدرسة العلمیة الدینیة المنظمة في کرکوك) لەساڵی ١٩٤٠ – ١٩٤١ دا بۆ ماوەی شەش ساڵ ئەوجا

---

[1] - بڕوانە: کەرکوك، گۆڤارێکی ڕووناکبیری گشتی وەرزییە، کە لەلایەن کۆمەڵەی ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتی کەرکوك دەردەچێت، ژمارە ٤، لاپەڕە ١٢٨، ١٢٩، ١٣٠، ١٣١، ١٣٢ساڵی ٢٠٠٩.

"تخرج" م کرد لەساڵی ١٩٤٥ – ١٩٤٦، بە پێی نیزامی ئەم جۆرە مەدرەسانە دەبوو بچوومایە بۆ (كلية الشريعة) لە بەغدا، کە ئەو ساڵە یەکەم ساڵی کردنەوەی بوو، بەڵام باوکم ڕازیی نەبوو بچم بۆ کلیە، بۆ ئەوەی کە هەر لە مەسەلەی مەلایەتی بەردەوام بم، ئەوجا لەبەر ئەم ئامانجەی باوکم هەر بەردەوام بووم لەسەر خوێندنی فەقێیەتی لە (المدرسة الدينية الملحقة بالمعابد) لە مزگەوتی ئیمام قاسم، چونکە باوکم (مدرس) بوو لەو سەردەمەدا، ئەوجا لای باوکم دەمخوێند بە پێی نیزامی ئەم جۆرە مەدرەسانە.

لە ڕێکەوتی (١٠ / ٩ / ١٩٥٥) لەم مەدرەسەیە لە خزمەتی باوکم ئیجازەی مەلایەتیم وەرگرت، ئەوجا ڕۆیشتم بۆ قاهیرە: بۆ (الجامع الازهر) لەگەڵ دەستەیەک لە فەقێکانی وڵاتی خۆمان هەموومان لە ئەزهەر وەرگیراین لە (معهد البحوث الاسلامية) في الازهر الشريف، لە قۆناغی دووەم. لەساڵی ١٩٥٥داو لە ینایری ساڵی ١٩٥٨ لەم (معهد) ە، تخرجم کردو لە (العشر الاوائل) بووم، پاشان لە (كلية الشريعة في الأزهر) وەرگیرام.

دەمخوێند لێرە تا کاتێک کە لە پۆلی دوو بوون، لە کاتی پێش کۆتایی ساڵی خوێندن بووین ئەوکاتە باری سیاسی وایکرد – بگەڕێینەوە بۆ عێراق لە گەڵ زۆربەی قوتابیەکانی عێراقدا ئەوانەی لە میسر ئەیانخوێند، ئەوجا بە گەیشتنەوەمان بۆ عێراق هەمووومان وەرگیراینەوە لە کۆلێژەکان، هەر کەس بە پێی تایبەتمەندی خۆی، منیش لەگەڵ هەندێک لەوانە وەرگیراینەوە لە (كلية الشريعة) لە بەغدا، هەر لە پۆلی دوو ئەوکاتە ماوەی (٤٥) ڕۆژ مابوو بۆ ئیمتیحانی کۆتایی ساڵ، سوپاس بۆ خوا سەرکەوتوو بووین ئەو ساڵە، بە سەلامەتی بەسەرمانا ڕۆیشت، لەساڵی ١٩٦١ لە كلية الشريعة تخرجم کرد.

دەبێ ئەمەش بڵێم: لەساڵی ١٩٤٨ لە خانەقای نۆمەر گومبەتی بە ئیمام حەسبی دامەزرام، لە پاش ئەوەی کە تاقیکرامەوە لەلایەن (المجلس العلمي) لە کەرکوك، لە ڕێکەوتی (١٣ / ١ / ١٩٤٨) لە (مجلس الشورى) ڕەزامەندی لەسەری دەربڕی، لە ڕێکەوتی (١٥ / ٢ / ١٩٤٨) فەرمانی مەلەکی دەرچوو بووم، ئەمەش دەقەکەیەتی:

لقد صدرت الأدارة الملكية المطاعة في ٣٠ مارت سنة ١٩٤٨ بتوجية جهة الأمامة بمسجد عمر الكنبدي حسبيا الى محمد صالح عمر بناء على تحقيق اهليتة بقرار المجلس العلمي في كركوك الصادر بتأريخ ١٣ / ١ / ١٩٤٨ والمقترن بتصديق مجلس الشورى بتأريخ ١٥ / ٢ / ١٩٤٨ واشعارا بذلك اعطيت هذه الوثيقة تحريرا في ٩ ايار سنة ١٩٥٠.

الختم

مدير الاوقاف العام

هەروەها بەردەوام بووم لەسەر ئیمامەتی خانەقاکەمان، لە کاتێکدا وەك لە (میسرو بەغدا) بووم، عەبدولقادری برام کردبوو بە وەکیل لەبری خۆم بۆ ئیمامەتێکەی خانەقا هەتا ساڵی ١٩٦١. پاش دەرچوونم لە زانکۆ، بە مامۆستای زمانی عەرەبی و ئاینی لە وەزارەتی پەروەردەو فێرکردن دامەزرام، ئەوکاتە لەبەر ئەوەی کە کۆکردنەوە لە نێوانی دوو کارا ڕەوا بژیم، لەگەڵ ئەوەشدا کە بڕوای تەواوم هەبوو خوا ڕازقە، بەڵام دیسانەوە هەر ناچار بووم "استقالە" بکەم لە ئیمامەتی خانەقا لە مێژووی (١ / ١٠ / ١٩٦١). دەمەوێ ئەوە بڵێم: بۆ یەکەم جار کاری وەزیفەی مامۆستاییم لە ناوەندی داقوق بوو لەڕێکەوتی (٣٠ / ٩ / ١٩٦١)، ئینجا لە داقوقەوە گواسترامەوە بۆ ناوەندی ئیمام قاسمی کوڕان لە کەرکوك ئەمەش لەڕێکەوتی (٢٠ / ٢ / ١٩٦٥) بوو.

دواتر لە ناوەندی ئیمام قاسمی کوڕانەوە لەڕێکەوتی (٤ / ١٠ / ١٩٦٦) گواسترامەوە بۆ (ناوەندی شەرقیەی کوڕان) لە کەرکوك.

لەڕێکەوتی (١٥ / ٩ / ١٩٧٤) لە ناوەندی شەرقیە گواسترامەوە بۆ (ناوەندی شۆڕش) لە کەرکوك، پاشان لەساڵی ١٩٧٧ لە ناوەندی شۆڕش، گواسترامەوە بۆ (ناوەندی عبدالرحمن الغافقی للبنین) لە کەرکوك، لەم ناوەندیەش لەڕێکەوتی (٨ / ٣ / ١٩٧٨) گواسترمەوە بۆ (المعهد الاسلامي) لە کەرکوك، ئەوجا لێرەدا مامەوە تا لەڕێکەوتی (١ / ٧ / ١٩٨٢) خانەنشین بووم[1]!.

جگە لەو کەسایەتییانەی باس کران چەندین کەسایەتی تر لە بنەماڵەکەدا هەڵکەوتوون، کە هەریەکەیان لە بوارێکدا خزمەتیان کردووەو جێ پەنجەیان دیارە.

[1] - جێی باسە مامۆستا مەلا محەمەد ساڵح لە ژیاندا ماوەو لە تەمەنی (٩٢) ساڵیدایەو لە گەڕەکی (زێویەی ئیمام قاسم) ژیان بەسەر دەبات.....نووسەر.

# مەلا ئەحمەدی حاجی ئیبراهیم ئۆمەر گومبەتی

نووسەر ئیدریس عەبدوڵڵا لە کتێبەکەیدا ئەمەی نووسیوە[1]: مەلا ئەحمەدی کوڕی حاجی ئیبراهیم ئۆمەر گومەتی، زانایەکی پایە بەرزی سەردەمی خۆی بوو، زانست و زانیاری لەسەر دەستی زانای پایە بەرز (شێخ عەبدولڕەحمان) فێربوو، هەروەها دەڵێ: ئەو زانایە لەسەر ڕێبازی تەریقەتی نەقشبەندی بووە، یەکێك بووە لە زاناو عولەماو نوسەرەکانی ئەم ڕێبازە.
هەروەها نوسەری بەناوبانگی عێراق (عەباس عەزاوی) بەم شێوەیە باس لە مەلا ئەحمەد دەکات و ئیدریس عەبدوڵڵا وەریگێڕاوەتە سەر کوردی کە دەڵێ: مەلا ئەحمەد کوڕی حاجی ئیبراهیم ئۆمەر گومبەتی کوردی زانایەکی لە خواترس و عولەمایەکی پای بەرزە ئەم زاتە لەلایەن (شێخ یەحیا کوڕی خالید مزوری) مۆڵەتی پێدراوە، کە لەو بارەیەوە (شێخ یەحیا مزوری) دەڵێت: (مولەتدرا بە مەلا ئەحمەدی کوڕی حاجی ئیبراهیم ئۆمەر گومبەتی) مۆڵەتدانەکەی لە مانگی ذولحجة ساڵی ١٢٤٠ کۆچی بەرامبەر ١٨٢٤ زایینی بووە. (*)
شێخ یەحیای مزوری لە وەسفی مەلا ئەحمەد دەڵێ: مۆڵەتم دا بە کوڕەکەم ئەو کوڕەی لە ناو دڵما جێگەی تایبەتی خۆی هەیە ئەویش مەلا ئەحمەدی کوڕی حاجی ئیبراهیم ئۆمەر گومبەتیە، بۆ ئەوەی کتێب و نوسینەکانی بیرمان بهێنێتەوە لە سەحیحی بوخاری و موسلیم و وەکتێبەکانی تری فەرمودەو فقەو گشت زانستەکانی تری ئاینی ئیسلام، هەروەك چۆن مۆڵەتیان پێدام لەلایەن شێخە بەرز و ناسراوەکان، منی هەژار (یەحیا کوڕی خالید مزوری).
ئیدریس عەبدوڵڵا دەڵێ: (عەباس عەزاوی) ئەمەیشی بۆ زیاد کردووەو دەنوسێت: کە ڕێگەی پێدرا لەلایەن زانایان و لەلایەن خولەفای مولانا خالید، پەرتوك خانەشی بۆ کرایەوە لە خانەقای ئۆمەر گومبەتی لە کەرکوك، کە زۆر کتێبی گرنگ و ئامۆژگاری گرنگی تیابوو،

---

[1] – بڕوانە: ئیدریس عەبدوڵڵا ئۆمەر گومەتی، لە دەروەندەوە هەتا نەیرە مێژوو، لاپەرە ١٧٧، ١٧٨، ساڵی ٢٠١٥.

(*) – تێبینی: مەلا عبدالکریم مودەریس دەڵێ: مەلا ئەحمەد کوڕی حاجی ئیبراهیم ئۆمەر گومبەتی، لە ساڵی ١٢٤٥ کۆچی بەرامبەر بە ساڵی ١٨٢٩ زاینی مۆڵەتی مەلایەتی لە (مەلا یەحیا) ی مزوری وەرگرتووە.... بڕوانە علماؤنا في خدمة العلم والدين – لاپەرە ٦٨... نووسەر.

بەشێك لەو كتێبانەی (شرح رسالة في الحكمة) اتمه في جمادی الآخر ساڵی ١٢٣٩ كۆچی بغداد، تعليقات على كتاب (تشريح الافلاك) للبهاء العاملي اتمها في شوال سنه ١٢٤٥ هجري في مدينة سلام، وشرح خلاصة الحساب للبهاء العاملي، جا له كۆتایدا بەم شێوە باس لە ژیانی مەلا ئەحمەد دەكات: ئەم زانا پایە بەرزە لە قەڵای كەركوك دەژیاو هەر لەوێش دەرسی دەوتەوە هەتا ئەو ڕۆژەی بە نەخۆشی تاعون خۆی و ماڵ و منداڵی بە یەك شەو وەفاتیان كردووە.



دەستنووسێكی مەلا ئەحمەدی حاجی ئیبراهیم ئۆمەر گومبەتی
ئەم دەستنووسە لە ساڵی ١٢٣٠ كۆچی بەرامبەر بە ساڵی ١٨١٤ زاینی
نووسراوە. لە ئەرشیفی م. ئیدریس عەبدوڵڵا ئۆمەر گومبەت

# مەلا قادری ڕەش



ئـەم زاتـە لـە گـەورە زاناکـانی سـەردەمی خـۆی ئـەژماردەکرێت، مرۆڤێکـی خوانـاس و رەوشـت بەرزو بوو، لە هەمان کاتدا کەسێکی قسە خۆش و خۆش مەشرب بوو، دانیشتوانی ناوچەی تەقتـەق و کۆیـە قسـەو بەسـەرهاتی خۆشـی لێ دەگێڕنـەوە، هـەروەها خـاوەنی کتێبخانەیـەکی گـەورەو بـەنرخ بوو، بە دەیان کتێبی ئایینی و کۆمەڵایەتی گـرنگ و پڕ بایەخی هەبوو، لەگەڵ چەندین دەستنووسی بەسود.

نـاوی تـەواوی: قـادر کـوڕی مـەولود کـوڕی عەبدوڵلایـە، بـە مـەلا قـادری ڕەش ناوبـانگی دەرکـردووە، نـاوبراو لەسـاڵی ١٨٩٠ز لـە دێـی سێگردکان هاتۆتە دونیاوە، لەمبارەیەوە مەلا ئەحمەد کوڕی حاجی مـەلا محەمـەد نـور بـۆی گێڕامـەوە و وتـی[1]: مـەلا قـادری ڕەش کـوڕی مـەولودەو خـەڵکی دێـی (ئیلنجـاغ) ی سـەر بـە شارۆچکەی کۆیە بوو،!

لە تەمەنی منداڵییەوە دەستی بە خوێندن کردووەو قورئانی پیرۆزی خەتم کردووە، جگە لـە زمانی کوردی زمانـەکانی عـەرەبی و فارسی و تـورکی بـە باشی زانیـوەو شیعریشی بە چوار زمان نووسیوە.

نووسەر ئیدریس عەبدوڵلا وا باس لە مەلا قادری ڕەش دەکات[2]: بۆ تـەواوکردنی خوێنـدن ڕوودەکاتە ناوچەی هەورامان و هەڵەبجە بۆ ماوەی دوو ساڵ لـەوێ خوێندوویـەتی، پاشان بـە فەقێیـەتی ڕوودەکاتـە ئێـران و لـەوێ ئیجـازەی مەلایـەتی بـۆ دووەم جار وەردەگرێت، مـەلا قادری ڕەش لـە ژیـانی مەلایەتیـدا چـەندان فـەقێی هـەبووەو ئیجازەی مەلایەتیشی پـێ داون لەوانـە: (مـەلا عەبـدولڕەحمان ئەحمـەد سـێگردکانی و مـەلا حەمـەدەمین مـەولود و مـەلا

---

[1] - چاوپێکەوتنی: مەلا ئەحمەد کوڕی حاجی مەلا محەمەد نور، ڕێکەوتی (٩ / ٦ / ٢٠١٦).......نووسەر.

[2] - سەرچاوەی پێشوو: لە دەروەندەوە هەتا ئەیرە -ئیدریس عەبدوڵلا، لاپەڕە ١٨٥، ١٨٧.

مستەفای پەلْكانەو مەلا سدیق ئیلنجاغی، هەروەها سەركردەی نەتەوەی كورد خوالێخۆشبوو (مەلا مستەفای بارزانی) لەلای مەلا قادری ڕەش قورئانی خوێندووە.

نووسەر لە درێژەی باسەكەیدا دەڵێ: مەلا قادری ڕەش خاوەنی دیوەخانێكی گەورە بووەو هەمیشە دەرگای ماڵ و دیوەخانی ئاوەڵا بووە، بۆ لێقەوماوان و خانە خوێیەكی باش بووە، بەردەوام لە دیوەخانەكەی مناقەشەو گفتوگۆی ئایینی و شەرعی ئەنجام دراوەو دیوەخانەكەی بۆتە مایەی ڕوونكردنەوەو بەرچاو ڕوونی موسڵمانانی ئەو سەردەمە.

وەك لێی دەگێڕنەوە مەلا قادری ڕەش مرۆڤێكی قسەخۆش و گاڵتەچی بووە، لەمبارەیەوە مەلا شەفیق گۆڵدەرە بۆی گێڕامەوەو وتی[1]: مەلا قادری ڕەش یەكێ بوو لە مەلا چاكەكانی ئەو سەردەمە، ماوەیەك لە دێی عەلەغێر مەلایەتی كردووە، پەیوەندی لە نێوان مەلا قادری ڕەش و سەید ئەحمەدی خانەقا زۆر خۆش بوو، جا ڕۆژێك سەید ئەحمەد بە مەلا قادر دەڵێ: مەلا چۆن دەبێ ڕەش بێ، تۆ بەس لە مەلا ناچی؟ لەو كاتەدا سەید ئەحمەد لەسەر كورسی دانیشتبوو، لە وەڵامدا مەلا قادر پێی دەڵێ: بەڵێ قوربان ڕاست دەفەرمووی، تۆش بە سەگنی سایەق دەچی، سەید ئەحمەد قاقا پێ دەكەنێ و دەڵێ: باشە وا دابەزیم.!

مامۆستا عەبدولەجید كوڕی مەلا قادری ڕەش بۆی گێڕامەوەو وتی[2]: باوكم لە چەند شوێنێك مەلایەتی كردووە لەوانە: (گۆپتەپە، عەلەغێر، دوبزو........هتد).

---

[1] – چاوپێكەوتنی: مەلا شەفیق گۆڵدەرە، لە ڕێكەوتی (٣١ / ١ / ٢٠١٦)، ڕەحیم ئاوا– كەركوك ، جێی باسە مەلا شەفیق كوڕی ڕەشید كوڕی فەقێ سەعیدە، لەساڵی ١٩٢٦ز لە دێی بیبانی لەدایكبوە. پیاوێكی تێكۆشەرو ڕۆشنبیرو كورد پەروەر و بەدینە، دانیشتن لە خزمەتیا زۆر دڵ ئاسوودە دەكا، یەكێ بووە لە كەسە نزیكەكانی كاكە حوسێنی خانەقا، ئێستا لە تەمەنی ٩١ ساڵیدایەو بەردەوام كتێب دەخوێنێتەوە......نووسەر.

[2] – چاوپێكەوتنی: مامۆستا عەبدولمەجید كوڕی مەلا قادری ڕەش، ڕۆژی دووشەممە ڕێكەوتی (٥ / ٩ / ٢٠١٦) كاتژمێر (١٥، ٥) ی سەر لە ئێوارە، تەقتەق.......نووسەر.

**کۆچی دوایی مەلا قادری ڕەش:**

پاش خزمەتێکی زۆر بە ئایین و کۆمەڵگەی کوردەواری لەساڵی ١٩٧١ز لە تەمەنی ٨١ ساڵیدا ماڵئاوایی یەکجاری لە دۆست و ئازیزانی دەکات و بە کۆچی دوایی مەلا قادری ڕەش کەلێنێکی گەورە کەوتە نێو زانایان و دانیشتوانی ناوچەی تەقتەق و کۆیەو دەوروبەری.

ئەم زاتە لە ژیانیدا سێ ژنی هێناوە بەم ناوانە:

١- عایشە کچی مەلا ئەحمەدی ڕەش، لەم ژنە یەك کوڕی بووە بەناوی: نەجمەدین.

٢- عاصمە کچی محەممەد مەردان، لەم ژنە سێ کوڕی بووە بەناوەکانی: (عەبدوڵلا، عەبدولڕەحمان، عەبدولمەجید).

٣- ئامینە کچی ئۆمەر ئەحمەد، لەم ژنە یەك کوڕی بووە بەناوی: (مەلا جەلال).

# مەلا محەمەدی ماملی ئۆمەر گومبەت



ناوی تەواوی: حاجی مەلا محەمەدی کوڕی دەروێش عومەر کوڕی مەولود کوڕی عومەر کوڕی ماملی کوڕی حاجی، ناوبراو لەساڵی ١٩٠٧ز لە دێی ئۆمەر گومبەت لە دایکبوە، بنچینەی دەربەندییەو لە بەرەبابی ماملە، لە تەمەنی ١٢ ساڵیدا قورئانی پیرۆزی لە خزمەت مامۆستا (مەلا عەبدولڕەحمان ئەحمەد) خەدیجە خوێندووە، پاشان هاتۆتە کەرکوك و خوێندنی پلەی (مستعدیی) و ئاخر مادەی لە خزمەت زاناو عەلامەی ئەو سەردەمە حاجی مەلا عومەری گومبەتی بووە، دواتر لە حوجرەی فەقێکانی خانەقای ئۆمەر گومبەتی دانیشتووە، ئەوجا لەم کاتانەدا گەلێك لە فەقێکانی ناو شار هاتونەتە خزمەتی، بۆ پیت و بەرەکەت دەرسیان لەلای خوێندووە.

## ئیجازەنامەی حاجی مەلا محەمەدی ماملی:

لەمبارەیەوە مەلا محەمەد سالح [1] کوڕی حاجی مەلا عومەر گومبەتی دەڵێ: لەناو حەوشەی مزگەوتی (ئیمام قاسم) ئاهەنگی ئیجازەی مەلایەتییەکەی حاجی مەلا محەمەدی ماملی بەسترا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ هەردەم جۆراوجۆرەکانی شاییەکان بەردەوام بوو، لە ڕۆژی هەینی لە پاش نوێژی عەسردا لەناو حەوشەی ئەم مزگەوتەدا باوکم ئیجازەنامەکەی خوێندەوە: بە دەنگێکی بەرز ئاوازێکی کۆك و پڕ سۆزو حەماسەوە ئەمەش لەساڵی (١٣٦٤ك- ١٩٤٤ز) دا بوو، جا لە دوای تەواوبوونی ئاهەنگی ئیجازە وەرگرتنەکەی خزمانی ئۆمەر گومبەت مامۆستا مەلا محەمەدی ماملیان بردەوە بۆ دێی ئۆمەر گومبەت و هەموو پێویستیەکیان بۆ جێبەجێ کرد، بۆ ماوەی ساڵانێکی زۆر لەسەر دەرس وتنەوەو ئیمامەت و ئیرشادی موسڵمانان بەردەوام بوو، هەمیشە مەدرەسەکەی پڕ بوو لە فەقێ، ئەم زاتە لە بەهاری ساڵی ١٩٩١ز لە تەمەنی ٨٤ ساڵیدا لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کردووە.

---

[1] — بڕوانە: گۆڤاری کەرکوك، ژمارە ٤، لاپەڕە١١٢، ١١٣، ساڵی ٢٠٠٩.

# مەلا عەلی ئۆمەر گومبەت

ناوی تەواوی: مەلا عەلی کوڕی محەمەد ئەمین کوڕی عەلی کوڕی عومەر کوڕی ماملە، مامۆستای بەڕێزمان لەساڵی ۱۹۱۸ز لە دێی (ئۆمەر گومبەت) ی سەر بە شاری کۆیە هاتۆتە دنیاوە، لەساڵی ۱۹۲۵ز قورئانی پیرۆزو چەند وردەکتێبێکدا لەم دێیە خوێندووە، دواتر هاتۆتە شاری کەرکوك و خوێندنی پلەی (مستعدیی) و ئاخر مادەی لە خانەقاو لای حاجی مەلا عومەر گومبەتی ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، سێ ڕۆژ تەرخان کرا بۆ ئاهەنگ گێڕان و شایی فەقێیانە بەو هۆیەوە لە ڕۆژی هەینی لە دوای نوێژی عەسر، لەناو حەوشەی مزگەوتی (ئیمام قاسم) بە ئامادەبوونی مامۆستاو فەقێکان و پیاوماقوڵان و داوەتکراوان لەگەڵ دانیشتوانی گەڕەکی ئیمام قاسم حاجی مەلا عومەر گومبەتی ئیجازەنامەکەی خوێندەوە، ئەمەش لەساڵی (۱۳٦۸ك - ۱۹٤۸ز) دا بوو، لەمبارەیەوە مەلا محەمەد ساڵح[1] دەڵێ: دوای کۆتایی هێنانی ئاهەنگی ئیجازەکە شێخانی دێی دوبز مامۆستایان برد بۆ دێیەکەی خۆیان، هەموو کارو خزمەت و پێویستەکانیان خستە سەرشانی خۆیان، ئەوجا مامۆستا حاجی مەلا عەلی بە بێ وچان لە دێی دوبز تێدەکۆشاو هەڵدەستا بە هەموو ئەرکەکانی دینی سەرشانی: بە هەموو توانایەوە هەمووکات مەدرەسەکەی پڕ بوو لە فەقێ.

لەساڵی ۱۹٦۰ز بە مامۆستا دامەزرا بۆ (العربیة والدین) لە قوتابخانەکانی وزارة التربیة والتعلیم، بە پێی "تخرج" کردنی لە "الدورة التربویة لرجال الدین" بەم شێوەیە مامۆستا مایەوە لە مەدرەسەکانی دێهاتەکانی دەوروپشتی دوبز بۆ ماوەی چەند ساڵێك، هەر وەك مایەوە لە مەدرەسەکانی ناو دوبز بۆ ماوەی ساڵێك تا لەساڵی ۱۹۸۱ز خۆی خانەشین کرد، ئەم زاتە لە کۆرەوەکەی بەهاری ساڵی ۱۹۹۱ز لە حاجی ئۆمەران لە تەمەنی ٦۹ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووەو لە شاری مەهاباد بەخاك سپێردراوە.

---

[1] – سەرچاوەی پێشوو: گۆڤاری کەرکوك، لاپەڕە ۱۱۳، ۱۱٤.

# مەلا ئەحمەدی دووەم



ناوبراو پیاوێکی زاناو لێهاتوو و رۆشنبیرە، هەروەها مرۆڤێکی قسەخۆش و زمان پاراو تێگەیشتووە، زۆربەی شیعرەکانی حاجی قادری کۆیی لەبەرەو لە بارەی شیعرەوە رۆڵێکی باڵای هەیەو بە دەیان شیعری نووسیوە، جگە لە زمانی دایك شارەزایەکی باشی لە زمانی عەرەبی و فارسی هەیە، دانیشتن لە خزمەت مەلا ئەحمەدو گوێ گرتن لە قسەکانی وەك ئەوە وایە لە پۆلی کۆلێژێکی زانگۆدا گوێ لە مامۆستایەکی پسپۆڕو شارەزا بگری.!

ناوی تەواوی: مەلا ئەحمەد کوڕی حاجی مەلا محەمەد نور کوڕی مەلا ئەحمەدی کۆر کوڕی بابارەسوڵە، دایکی ناوی (جەمیلە کچی سەعید) ە، لە بارەی ساڵی لە دایکبوونی، مەلا ئەحمەد خۆی بۆی گێڕامەوەو وتی[1]: لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق لە سەردەمی (مەلیك فەیسەڵی یەکەم) لە دێی (دووگردکان) ی سەر بە ناوچەی دزەیی لە دایکبوومە، ئەمەش لەساڵی (١٩٢٠ – ١٩٢١) بووە، مەلا ئەحمەد لە درێژەی باسەکەیدا دەڵێ: بە منداڵی لەگەڵ (ئەحمەد حەمەدەمین) کە ئاغای دێی دووگردکان بوو، بە یەکەوە لەلای دایکی کە ناوی (ئایشە خانی شێخ مارفی هەڵەجە بەرزنجی) بوو، شیرمان خواردووەو پەیوەندی باوکم لەگەڵ بنەماڵەی ئەحمەد حەمەدەمین و براکانی زۆر خۆش بوو، لەو سەردەمە گوزەرانمان زۆر باش بوو، بە جۆرێك (١٥٠) سەر مەڕو (١٢) گامێشمان هەبوو !

هەر لە تەمەنی منداڵییەوە لە خزمەتی باوکی قورئانی پیرۆزو چەند کتێبێکی وردی خوێندووە، پاشان چۆتە شارۆچکەی کۆیەو لە مزگەوتی (مەلا فەتحوڵڵا) و مزگەوتی (مەلا مەعسوم) فەقێیەتی کردووە، هەروەها لەلای ئەم مامۆستا بەڕێزانە خوێندوویەتی لەوانە: (مەلا عەبدولڕەحمان لە قوشقایە) و (مەلا سدیق تەقتەق لە بۆگرد)، مەلا ئەحمەد دەڵێ: لە

---

[1] – چاوپێکەوتنی: مەلا ئەحمەد کوڕی حاجی مەلا محەمەد نور، لە ڕێکەوتی (٩ / ٦ /٢٠١٦) دارەتوو– هەولێر......نووسەر.

بیرم دێ کاتێ فەقێ بووین دەمانخوێند: مامۆستا لەسەر تەختە ڕەش (صبورە) دەینووسی ساڵی ١٣٥٠ كۆچی كە دەكاتە بەرامبەر ١٩٣١زایینی، تا پلەی موستەعیدم خوێند.!

لەساڵی ١٩٤٦ لە كۆیە پەیوەندی بە پارتی دیمكراتی كوردستان كردووە، لەگەڵ ئەم بەڕێزانە كاری كردووە لەوانە: عەبە خەوە، ساڵح شەمس، حەمە شوان و.......هتد.

پاشان بە مەلایەتی دەچێتە دێیەك لە قەراج كە سەر بە (شێخ محێدینی هەولێر) بوو، لەوێ بۆ ماوەیەك وەك پێشنوێژو ووتار خوێن دەس بەكار بوو، هەروەها لە كۆیەو دەوروبەری هەولێر مەلایەتی كردووە، دواجار چۆتە دێی (قوتان) ی سەر بە ناوچەی دووبز لە پارێزگای كەركوك بۆ ماوەی (٣) ساڵ مەلایەتی كردووە كە ئەو كات دێی قوتان لە ژێر دەسەڵاتی (شێخ سەعیدی قوتان) بوو، كاری مەلایەتییەكەی بێ مووچە بووە واتە: (حسبة لله).

پاشان بۆ بژێوی ژیان لە دائیرەی شارەوانی (بەلەدیە) لە كەركوك دامەزراوە، لەساڵی ١٩٥٨ دوای شۆرشی چواردەی تەمووز پەیوەندی بە ریزەكانی شیوعی دەكات و بۆ ماوەی چوار ساڵ لەو پارتە كاری كردووە.

بە هۆی سەركەوتنی شۆرشی چواردەی تەمووز بە سەرۆكایەتی (عەبدولكەریم قاسم) مەلا ئەحمەد شیعرێكی زۆر جوانی هۆنیوەتەوە لە ژێر ناوی (ئەی برای فەلاح)، ئێمە بەشێكی لێ بڵاودەكەینەوە كە دەڵێ:

ئەی بـــــرای فــــــەلاح دامـــــــاوی هـــــەژار
گیـــــرۆدەی داوی كلــــــكی ئیستعمـــــــــار
ڕەنگ زەردو بـــــرسی بـــــە دڵی پـــــڕ قینت
هەڵســـە تێكــــۆشــــە بـــــــۆ ژینـــی چینت

* * *

ئێــوەی بــــــار كــــــەوتوو كـــــزو دامـــــاون
جێمــــاوی خێـــــڵ و ســـــەر لـــــــــە شێواون
ساڵــــەهـــــای ســـاڵــــە ئێـــــوە رەنجەدەن
بۆ نەتـــــان دەزانی كــــــە بـــــۆ كـــێ دەبــــەن

* * *

دۆشەکی نەرمی ماڵ و میوانی
کورسی و مۆبیل و ئەولاو دیوانی
وا من پێت ئەڵێم خۆتش نەزانی
گشت خوێنی تۆیە نەك ڕەنجی شانی

* * *

ئەی برای فەلاح داماوی برسی
تا کەی مل کەچی بۆ ئاغا بۆ کورسی
شان بەرە شان برای جووتیارت
بۆ ڕۆژ تەنگانە ئەوە خەم خوارت

* * *

هاو دەردو هاو خوێن هەر بەش خوراون
کاروان ناوی کرد ئێوە بەجێ ماون
بە چڵەی زستان بە گەرمای هاوین
هەر لە پایزستۆ هە تاکو چۆغین *

* * *

هەوڵ و تەقەڵاو ڕەنج شانی تۆیە
کەشخەیی ئاغا گشت خوێنی تۆیە
یەکتری بگرن بە پیاو بە ژن وردو درشت
تەنها پەنجە بێ کارە، بەڵام کۆڵە مشت نەبی بە چشت

* * *

*- چۆغین، واتە: خەرمان، ئەم وشەیە دانیشتوانی ئۆمەر گومبەت بە کاری دێنن.

له ساڵی ١٩٦٢ دەستی لە کاری حیزبی کێشاوەتەوە، هۆکاری دەست لە کارکێشانەوەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە حیزبی شیوعی داکۆکی لە گەلی کورد و مافە ڕەواکانی ناکات، بۆیە مەلا ئەحمەد دوای چوار ساڵ کارکردن لەوپارتە، دەستی لە کار کێشاوەتەوە.

## مەلا ئەحمەد و ڕێبازی تەسەوف:

لە بارەی ڕێبازی تەسەوف مەلا ئەحمەد خۆی بۆی گێڕامەوەو وتی: باپیرم مەلا ئەحمەدی کۆر سۆفییەکی ناسراوی سەردەمی خۆی بوو، یەکێ بوو لە موریدەکانی شێخ نوردەینی بریفکان، هەروەها باوکم پابەند بوو بە ڕێبازی تەسەوف، تەریقەتی لە (شێخ عەبدولڕەحمان) ی بریفکان وەرگرتبوو، منیش بۆ ماوەی بیست ساڵ لەگەڵ ڕێبازی تەسەوف خەریك بووم، ڕێبازی تەسەوف دەریایەکی گەورەی زانستەو زۆریش بەر فراوانەو چەندین تەریقەتی لە خۆگرتووە کە هەموویان بۆ پاکەرەوەی نەفس و دەروونی مرۆڤ هاتوون، من بۆ خۆم پابەندم بە ڕێبازی تەریقەتی (نەقشبەندی) و زۆرم خۆش دەوێ.



مەلا ئەحمەد لە تەمەنی لاویدا

## هەڵوێستی مەلا ئەحمەد لە بارەی ئەم کتێبەوە:

وەك پێشتر ئاماژەم پێدا، نووسراوێکی ئەوتۆ لە بارەی ژیاننامەی مەلا ئەحمەدی کۆرو نەوەکانی وەك پێویست نەنووسراوە، ئەگەر چی لە هەندێ رۆژنامەو گۆڤارو کتێب دا، ناوی مەلا ئەحمەدی کۆر یان حاجی مەلا محەمەد نور هاتووە، بەڵام دیسان لە ئاستی ئەم کەڵە پیاوانە وەك پێویست نییە، بۆ ئەم مەبەستەو کۆکردنەوەی زانیاری زیاتر، ئەوەبوو سەردانی زۆر بەڕێز ماموٚستا مەلا ئەحمەدم کرد، عەرزم کرد ماموٚستا ئێمە بە نیازین لە بارەی بنەماڵەکەتان کتێبێك بنووسینەوە، بۆیە هاتومەتە خزمەت جەنابت وەکو بیستوومە دەستنووسی کۆن لە بارەی ژیاننامەو شیعرو تەسەوف و........هتد، لەلای بەڕێزتان هەیە.

لە وەڵامدا وتی: وەڵلاهی زۆرم پێ خۆشەو زۆریشم لەلا مەبەستە ئەم کتێبە سەرکەوتوو بێ، لە بارەی دەستنووسەکان زۆر ڕاستە هەمووی لای خۆم پارێزراو بوو، بەڵام ئێستا لەلای فوئادی کوڕمەو دەستی بەسەردا گرتووەو نامداتەوە، بەڵام ئەوەی لە بارەی مەلا ئەحمەدی کۆرو باوکم دەزانم و بەشێکی خۆم تێدا ژیاوم و بۆتی باس دەکەم و تۆش لای خۆت بیانووسەرەوە.

پاشان بۆ هەمان مەبەست چوومە لای فوئاد لە قوشتەپە، بیرۆکەی ئەم کتێبەم بۆ گێڕایەوەو وتم: لە بارەی بنەماڵەکەتان چ زانیاریەکت هەیە یان ئەگەر دەستنووسێکت لەلا بێ بەڵکو هاوکارمان بیت بۆ ئەوەی ئەم کتێبە زانیاری زیاتر لە خۆبگرێت و دەوڵەمەنتربێت،

لە وەڵامدا وتی: هیچم لا نیە!!

منیش لای خۆمەوە هەڵسام بە کۆکردنەوەی ئەو بابەتانەی کە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا باس کراون، هەروەها لەگەڵ ئەو زانیارانە کە مەلا ئەحمەد پێی داین و گەران بە دوای زانیاری لە کتێب و چاوپێکەوتن و سەردانی مەیدانی لەگەڵ برای بەڕێزم کاك سەرکەوت بە ناوچەی تەقتەق و کۆیەدا، لە ئەنجامدا سوپاس بۆ خوا دوای هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆر توانیمان ئەم کتێبە بێتە بەرهەم، لە کۆتایدا داوای لێبوردن لە خوێنەری ئازیز دەکەین کە نەمان توانی ئەو دەستنوس و سەرچاوانە بخەینەڕۆ، ئەمەش بۆ ئەو باسە دەگەڕێتەوە کە لەسەرەوە ئاماژەی بۆ کرا.

# دەقی زنجیرەی بنەماڵەی
# مەلا ئەحمەدی كۆر بەم شێوە هاتووە[1]

**هو الملا الشيخ احمد كۆر بن السيد بابا رسول بن السيد خورشيد بن السيد ابـراهيم بـن السيد محمد بن السيد رسول بن السيد محمد بـن السيد احمـد بـن السيد علي بـن السيد يوسـف بـن السيد بايزيد بن السيد نورالدين بن السيد هادي بن السيد ابوبكر بن السيد محمـود بـن السيد محمد الملقب ب (السيد محمد زاهد البيرخدري شاهو) بن السيد محمود المدني بن السيد جعفـر بن السيد حسين بن السيد محمود الينبوعي بـن السيد رحمـة الله بـن السيد موسـى بـن السيد حسين الصامت بن السيد هلال بن السيد محمـد خلـف بـن السـيد منهـال بـن السيد ماجـد بـن السيد عبدالرحمن بن السيد قاسم بن السيد إدريس بن السيد سلطان جعفر بن إمام علي هادي النقي بن إمام محمد جواد بن إمام علي رضا بن إمام موسى الكاظم بن إمام جعفـر الصادق بـن إمام محمد باقر بن إمام زين العابدين بن إمـام حسـين شـهيد كـربلاء بـن إمـام علـي و فـــاطمة الزهــراء بنت حضرة النبي (محمد) (صلى الله عليه وآله وسلم).**



[1] - تێبینی:
ئەم شەجەرەیە بە ناوی (**شجرة سادات ملا احمد كور في كركوك**) كە لە ڕۆژی سێشەممە ڕێكەوتی (٢٧ / ١١ / ٢٠٠١ز) لە كەركوك دەرچووە و لەلایەن ژمارەیەك كەسایەتی و سەرۆك هۆزی ساداتی پیرخدری مۆر كراوە.

ئەدیب و شاعیری کەرکوك مامۆستا شێخ حوسێن بەرزنجی ستایشی مەلا ئەحمەدی کۆر دەکات، بەناونیشانی: (خواناس و ئەهلی ئیمان)

خواناس و ئـــەهلی ئیمان
دڵ سۆزو ســاغ مـــوسڵمان
شیعری دەوت سێ زوبـــان
هەمو نایـــاب و زۆر جوان

لە فـــارسیا مـامــۆستا
لە عـــارەبی نـــاوەستا
کوردیشی لــە بــەر دەستا
هەڵبـەستی ڕێــك و ڕەوان

ئەحمەدی کۆر مەشهور بوو
لە کـاری خــراپ دور بــوو
موبارەك لـــە نـاو نور بوو
پاك و چـــاك و مــوسڵمان

وەلی بوو پیاوی خـــوا بوو
زاهید پشت لـــە دنیا بوو
لە عیرفـــانی وریـــا بوو
روحـــــانی خـاوەن ئیمان

له خــواوه زۆر نزیـــك بوو
له تاعــەتا خـــەریك بوو
له زۆر خێرا شەریـــك بوو
بە گوێرەی ئەمـری قورئـان

ناویم دەبیست مـن زۆر زۆر
بە هەڵبەستی جـۆراوجــۆر
جەنـــابی ئەحمەدی کــۆر
له شـاعیرە گـــەورەکـــان

حوسێن بەرزنجی هـــەردەم
خزمەت دەکـــا زۆرو کـــەم
بە دەس بە دەم بە قەڵـەم
وا لـــه خزمــەت زانایان

## شینی/ حاجی مه‌لا محه‌مه‌د نور[١]:

کوا مه‌لا احمدی کـــــۆری گــۆڕ قــــه‌ره‌ج
مه‌عده‌نی عیلم و گـــــه‌وهه‌ر گـه‌وهه‌ر سج

نا خه‌له‌ف نه‌بوو لــــــــه جێگه‌ی دا کوڕ
محمد نـــــووری ئـــــــــازاو کتــو پـــڕ

جێگه‌ی گرته‌وه لـــــه وه‌رع و لــــــه دین
ره‌حمه‌ت لـــــــه گۆڕیان الله و ئـــــامین

له عیلمی فــــــه‌رع و ئوسول و حـــــه‌دیس
مامـۆستایـــه‌ك بـــــوو وه‌ك ابی ئیدریس ([٢])

به زوبـــانی تـــورکی و کـــوردی و فـــارسی
وه‌کو عـــاره‌بی ئـــه‌شعـــــاری خـــورسی

---

[١] – مامۆستا مه‌لا مه‌حمودی کزه‌ڵ له سالّی (١٩٤٨) له گوندی زه‌ردك ئه‌م شیوه‌نه‌ی بۆکۆچی دوایی حاجی مه‌لا محه‌مه‌د نور کردووه، ناوبراو له‌سالّی (١٩٢٧) له ناوچه‌ی هه‌ڵه‌بجه له دایکبووه‌و له‌سالّی (٢٠١٤) له ته‌مه‌نی ٨٨ سالّیدا مالّئاوایی له جیهان کردووه...... به سوپاسه‌وه ئه‌م شیعره‌م له به‌رێز نوسه‌ر مه‌لا شاخی له ڕێکه‌وتی (٢٨ / ٣ / ٢٠١٧) وه‌رگرتووه......نووسه‌ر.

[٢] – ابی ادریس، شاعیر مه‌به ستی له ( ئیمام شافعی) یه.

بۆیە من بەدل گرانە دەردم
بێ مێژوو رۆیی ئەدیبی کوردم

ئەدەب ناو ئێمە ژێر پێ کەوتووە
ئەدیب وەك خۆمان گیانی بردووە

شینمەو برا تازە شینمە
بۆ ئەم زاتانە من گرینمە

چرای رووناکی بێ نوورینمە
هەورازی لێژی بێ موعینمە

**شیعری حاجی مەلا محەمەد نور:**

## ( سیحری چاوت )

سیحری چـاوت بۆ دەوای دەردی غــەریبان کافییە

لەعلی لێوت بــۆ برینم مەرهــەمێکی شــافییە

دڵ ڕەئیسی عــاشیقانە شایــەدن ئــەمڕۆ هەموو

نـوونی ئەبرۆ عەینی چـــاوو میمی زوڵفی کــافیـیە

بۆ مەلە گــەر بێتە سـەرخەت کێ ئەڵێ ئەم سۆنەیە

دجلەیی یـــــاخود فــــوراتی زابییە ،غـەرافییە[1]

غەمزە بـــازو دڵ نــــەوازە بێ نیــــازە دڵبــەرم

موو بــە مـوو ئەبڕێ بە دائیم وەك لـە دەورەی نافییە

چی بڵێم دەرحــەق بە تـوو ئـەی نازەنینی شۆخەکەم

تەعنەیەکت لێ بـــدەم مەعلوومــە بێ ئینسافییە

سینـە ســـاف و بێ خیـلاف و بێ گــەزافە یارەکەم

بۆ ڕەقیبان تــونــد و تیژ و دڵ شــکێن و جــافییە

وەسفی زوڵفـت زۆر درێــژە وەك شەوی زستان و غەم

بەسیە ( نوری )[2] با بڵێن تـــەنگی دەمی وەك قـافییە

---

[1] - غەراف ناوی ڕووبارێکە لە باشووری عیراق.

[2] - ئەم هۆنراوەیە: بۆ یەکەم جار لەلایەن عوبێد شێخ لەتیف بەرزنجی، لە گۆڤاری کاروان، ژمارە ٨٤، لاپەڕە١٣، ساڵی ١٩٩٠، بڵاوکراوەتەوە.

حاجی مەلا محەمەد نور بۆ کۆچی دوایی (شێخ محەمەد عەلی)[1] ئەم شیوەنەی بۆ کردووە کە دەڵێ:

ئەی گـــوڵی ئەهلـی تەریقەت جوملـەی یـــــارانی دین
کانی مـورشیدی حەقیقەت کـــۆچی کـــرد بۆ ژێر زەمین
کۆچی کـــرد ئەز لـــۆی نەمێنم دڵ برینـــدار و حـــەزینم
چاو بە گریـــان دڵ بە خوێنم بۆ شەهی ڕوومەت گـــوڵین

بۆ شەهی جوملەی فەریـــدان وەی لـــەمە دنیا بوو وێران
قور بەسەر سـۆفی و مریـــدان هـــەر بکەین گریـــان و شین
با بکەین گـــریان و هـــاوار جوملەی ئەحبـــاب و ئەغیـــار
بۆ تـەبیبی هــــــەر بـــرینـدار ڕووبنێین دائیـم غـــەمین

ڕووبنێین غەمناك و مەحزوون و چاو پڕ ئەسرین جگەر خوون
هەر وەکـــو شەیدا و مـەجنوون دڵ بەجـــۆش دیـــدە نەمین
دڵ بەجـــۆش و داغـــدارم پڕ لـــە ژان و پڕ لــــەنارم
ڕۆژ و شەب وابێ قـــەرارم میسلی تـەیـــری دەرکـــــەمین

شوبهی بولبول ئەز دەنـــاڵـــم هــــەر بەئەفغان و خەیاڵم
مەغموومـی دوو چـــاوی کــــاڵـــم هەر بەداغ و دڵ حەزین
دڵ حەزین و مـــاڵ خرابـــم کـــوورەی مەجمەر لـــە هابم
ئەز لـــە تـاوان وەك کەبـــابـــم بۆ حەبیبی شـــای مەتین

---

[1] - ئەم زاتە کچەزای شێخ نورەدینی بریفکانە و یەکێ بووە لە پیاوچاکان و زانایەکی گەورەی سەردەمی خۆی بووە، لەساڵی ١٩١٧ز کۆچی دوایی کردووە. ئەم پارچە شیعرە لە گۆڤاری کاروان – ژمارە (٨٥) ساڵی ١٩٩١ لە لایەن شێخ عوبێد شێخ لەتیف بەرزنجی بلاْوکراوەتەوە... نووسەر.

مەحبووبی شــاهی مەتین بوو قــوتبی عالەم ئەو یەقین بوو
بۆ مــوسڵمانان مــوعین بوو ســەممی شـــاهـــی ئەمین
ئیســمی وی حــەرفی میم بوو حێ و دالیش هــەر قەدیم بوو
ئالی پێغەمبەر کــەریم بوو شــاهــی ســانی موبین

ناوی ســانی وی عــەلی بوو بێشکــە مەعلووم وەلی بوو
ئەو لـــە نـــووری ئەزەلی بوو نوتفەی تـــاهیر یەقین
نوتفەی تــاهیــر منــەوەر زوبــدەی ئەولادی حــەیــدەر
چراغی ئـــالــی پێغەمبەر هـــادی گـــومــراهی دین

هادی گــومــراهی تەریقــەت مەنبەعــی عیلم و شەریعەت
مەعــدەنی ســـڕڕی حەقیقەت چۆڵی کــرد مــوڵکی زەمین
چۆڵی کرد دنیــای وێران تەعــزیــەتی ئــەرز و ئــاسمـــان
بۆی بــەشەوقن حــۆر و غیلمان قــەسر و حــەوزی نــازەنین

نیعمەت و میوەی لــەزیــزە نەخــل و ڕوممـــانی تەمیز
مەعلوومە بۆ شێخ لــەزیـــزە وەی سەلا لـــەمنی حـەزین
وەی قیامــەت لێمە ڕابــوو ئــەو لــۆمــە پشت و پەنـــابوو
پاشی وی حــاڵمــان خرابــوو مـــاین پەرێشـــان بێ موعین

بێ موعین بێ نەصیر مــاین بــۆ نەفس و شەیتان ئەسیر ماین
بێ پیر و بێ دەستگیر مــاین حـــەق بـــدا شیفــای برین
حــەق شیفامان لـــۆ بنێرێ زەنب و عوسیــا نمـــان وەشێرێ
ڕووی خۆمان لێ وەرنــەگێڕێ بەڵکــە نـــابین خـــاسرین

خاسری دنیا و قیامــەت ڕەبی لــۆن هـەڵکەی عەلامەت
بەڵکو پێمان بکـرێ ڕەحمەت یەك پەیـا بێ پۆست نشین
پۆست نشینی زاتــی ئەنومر پێی کـەرەم کـا حەیی ئەکبەر
تاج و خەلعاتی منــەومر لـــۆی بنێرێ شــــای مەتین

لۆی بنێرێ تاج و خەلعەت پێی کـەرەم کـا جاهو عیزەت
بەڵکو بۆمـــــان بێتە نەفعـــەت نــافیعی دنیا و دین
نافیعی دنیـــای مــونیرە جـــەددی وان خەیـرو لبەشیرە
هەم لـــە بـــۆ وان دەستگیرە ڕەهبەری هــــادی مـوبین

هــادی کـوللی ( ضلیــلان ) دەستگیـــری بێ دەلیـلان
قــائیدی کــۆر و زەلیلان وایـــە وێ ئیجـــازەی دین
وای بـــۆ ئیزنی سلـووکـــان بـۆ فەقیر و بۆ مەلووکـــان
پێ کــەرە کـــاشای بریفکـــان مەئزوونی قـوتبی مـوبین

مەئزوونی قــوتبی گــەیلانی بــا پیری خـۆی غەوسی سانی
قوتبی عالــەم بریفکـــانی جـــەددی خۆیـــەتی نورەدین
( نــوری ) موزنیب و عـــاسی پڕ لـــــە دەردو قەلبی عــاسی
( یوم یؤخذ بـــالنواصی ) [*] ئەو لـــــەگــەڵ وان تــابعین

---

[*] - بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، گۆڤاری کاروان، لاپەڕە ١٤، ١٥.

حاجی مەلا محەمەد نور لە ساڵی ١٩٤٣ ئەم شیوەنەی بۆ کۆچی دوایی مامۆستاکەی مەلا محەمەدی جەلی زادە (مەلای گەورە) *کردووە کە دەڵێ:

موسڵمانان چ قەومــاوە عێراق وا پڕ لــــە ئەفغانە
بەڵێ سەرداری عالــەم چوو هەموو کەس دڵ پەرێشانە
لە چاو ئاوو لــــە دڵ خوێنە دەرێژم هــەروەکو جۆگـە
ئەما سەبرم لە بەر چــاوم کـــە دنیا عەینی زیندانە
(ئەڵا) ئەی تالیبانی مەدرەسە تـەنها مەکـەن شیوەن
کە بۆ کورد و عەرەب و تورك و عەجەم ئەم شینە یەکسانە
جەلی ئیبن جەلی بوو واریسی عیلمی عـەلی بوو قـــەت
خەتیب و شـاعیری وەك ئەو نەحـەسـانە و نەسەحبـانە
جەلی زادە محەمەد ئـەعلـــەم و ئەرشەد نەبوو میسلی
لە خەتتی موڵکی ئیسلامــا کـــە ئەوبوو دوڕی یەك دانە
محەمەد ئیبنی عەبـدوڵلا جـەلی تـر بوو لــە ئەجدادی
بە مەعقووڵی ئصوڵی عیلمی ئــــەو مەقبوڵی شاهـانە
بەکوردی ئەو بەیانی کـرد مەعـانی ئایـــەتی قورئان
کەسێ بیکڕێ بەسەد لیرە پەڕەی لــــەم نوسخە هەرزانە
مەداریس مینبەر و میحــراب بەبێ ساحێب وەکـو ئێمەن
فەقێ ئێوەش بە بێ بــاوك هـەتیو حــاڵی پەرێشانە

* - هەمان سەرچاوە: گۆڤاری کاروان، لاپەرە ١٤.

کتێبخانەی بەجێماوە لـــــــە علمی بـــاوك و بـــا پیری

بە تەحریـــــری حەواشی ئـــــەو منەووەر بوو کتێبخانە

لە تەفسیر و شەریعەت بوو حـــەدیس و نەشری هەر عیلمێ

بە موشتاقی وەهـــــا سەرفی حەیـــاتی کـرد بە مـەردانە

لە قەسر و باغی سەر شـــاری بە پێی بازووکی وای هەڵدا

لە قەسری سەنعـــــەتی بـــاری رەفیقی حـــۆر و غیلمانە

( چنارۆك ) ی بـەهەشتی دی مەلـــــەك رێحـــــانی بۆ هێنا

لە بـــاتی ( کانی خاتون ) ی لــە کـەوسەر تێراو و ڕەییـانە

هەتا مابــوو هەموو مەحبوبی یەکتربووین عەجـــەب ئێستا

لە من شیـن و لـــــەوی شــادی نیشانـــــەی نـــوری ئیمـانە

( بحمدالله ) کــــە جێی خــاڵی نیـیە ئـــەو زاتی بێ هەمتا

بە کــاك ( نــوری ) سەعادەت مـەندو مەسعودی لـە مەیدانە

دەخیلتان بم وەکو عــارەب بکـــەن تــەدریس و بێ تەقصیر

بەڵێ عالـــەم ئـەلــــەکتریکی جــــەلی دائیم درەخشـــانە

بە شارەت بۆ قصـور و حـۆری جــەننەت بێ کــە تەشریفی

نەبوو مەسعود و فاروقە لـــــــە خزمــــەت باوکی میوانە

سەرا پا عەینـــی جەوهـــەر بوو وەکـو شـاهید ئەڵێ ( نوری )

کە جـەوهــەرداره تەئـــریخی بـــــە شادی حۆر و غلیمانە

له قەسر و باغی ئەم دنیا بە ( پێ بازۆکی ) وای هەڵدا
گەیشتە ( جنە المأوی ) خەریکی بەزم و سەیرانە
بڵێ مزگەوتی گەورەش بابگری بێ کەس بۆ خۆی
نەما واعیظ مودەڕیس چۆڵی کرد ئەم حەوش و هەیوانە
لە پاش توو ( سۆلی پاشا ) هەڵدەڕێژێ ئاوی چاوانی
وەکو بولبول لە دووری گوڵ کە پیشەی شین و گریانە
ئەگەر چی دەوری ( قەسرۆک ) ی گەلێ گوڵ هاتە پشکوتن
بەهار و پایزی ئێمە بە بێ توو عەینی زیندانە

**حاجی مەلا محەمەد نور لەساڵی ١٩٤٦ز بەهۆی ڕاگەیاندنی کۆماری[١] کوردستانەوە لە شاری مەهاباد ئەم شیعرەی نووسیوە:[٢]**

گەر خودا مەیلی لـــەسەر بێ خـانـــەدانێ چـــۆڵ نەکا
دوور لە فیکری کوولی کـــەس، شێرێکی بـــۆ پەیدا ئەکا
هەر چرایەکی خـــودا مـەیلی لـــــەسەر مـــانی هەبێ
هەر منەوەرتـــر دەبێ عـــالـــەم هەمـــوو فـــوی لێ بکا
داهیـەی دابـــوو دەروونی عـــالــــەمی هێنـــــا هـەژان
چاوەڕێن ئەم حـاڵـــەتە ئەمڕۆ خـــودا تەبـدیلی کا
شەمسی عزالدیـن لـــەسـەر لێواری ئـوفـق وا (طالع)ە
یا خـودا هـەروا هـــەڵاتـــوو بێ غـرووب ڕووی تێ نـەکا
غەم لـەگـــەڵ شـادی بەشـەر هـــات و گـــوتی نۆبەی منە
ئاخری عـزەت وەهـــا، هات بـوو بـە تـــأریخ (غەم شکا[٣])

---

[١] – کۆماری کوردستان لەلایەن جەنابی قازی محەمەد (١٩٠١ – ١٩٤٧)، لەساڵی ١٩٤٦ز لە مەهاباد بە ئامادەبوونی هەزاران کەس ئەو کۆمارە ڕاگەیەندرا، مەخابن لەساڵی ١٩٤٧ز لەلایەن دوژمنانی کورد کۆماری کوردستان لە ناوچوو، پاشان قازی محەمەد و برای و ژمارەیەك لە ئەفسەر لەلایەن وڵاتی ئێران و ناحەزانی کورد لە گۆڕەپانی چوارچرای مەهاباد بە بێ تاوان لە سێدارەدران.....بڕوانە: گوڵستان، ژیانی ناووداران و شاعیرانی کورد، لە ئامادەکردنی: مەلا سامان هەڵەبجە، لاپەڕە ٢٣١ساڵی ٢٠١٤.

[٢] - ئەم هۆنراوەیە بە سوپاسەوە لە بەڕێز کاك مەلا شاخی لەڕێکەوتی (٢٨ / ٣ ٢٠١٧) وەرگیراوە.......نووسەر.

[٣] – وشەی (غەم شکا) بە پێی حروفی ئەبجەد دەکاتە ساڵی ١٣٦٦کۆچی، بەرامبەر ساڵی ١٩٤٦ زایینی.

## شیعری حاجی مەلا محەمەد نور:

### ( سەر لەوحەی عەریزەم ) [1]

سەر لەوحــەی عەریزەم عەرزی دوعـــا و سەلامە
چــونکە سەلامی یـــاران خۆشتر لــەهەر کەلامە
ئەو کاغەزەی بەبێ زەرف قـاسید ( حەمە غەرییە ) *
بۆ سەرفـــرازی داعـی چشتێکی زۆر عـــەجیبە
بۆ ســەر بڵندی ئێمــە گـــەر کـــاغەزان بنێرن
مەعلووم دەبێ لــەهــەر کەس ئەهلی وەفا و خێرن
شاهید ( حەمە غەرییە ) بــۆ مـەسئەلەی وەفـاتـان
ئێوەن ئەهلی حەمییەت وەفـــا مـــاوە لـەلاتـان
وەگەر بەبێ وەفــایی هـــەر عەیبی خـــۆم دەزانم
چەنـــدی بڵێن زیـاتـــر قەڵب و قەڵب تـــرانم
بۆ هـــەر ئمـووری تەکبیر خـــۆتـان بـــەمن دەلیلن
زۆر عەیبە گـــەر بــرادەر پێتـــان بڵێم وەکیلن
فەرمانبەر و مـوتیعم بـۆ هـــەر ئەمرێ بفـەرمـوون
گەر بۆی نــەبێ موخالیف تەقدیری حەیی بێچوون
غەمخـــواری ئێوە بـــۆ من هـــەر ئیدعـــای خۆمە
حاجەت نیــیە بفەرمـــوون هــەروەك کـڵاشی دۆمـە

---

[1] - بڕوانە: گۆڤاری کاروان. لاپەڕە ١٥.

* - شاعیر ئەم نامەی بۆ دۆستێکی خۆی ناردووە. لەڕێگەی (حەمە غەریب) ناوێك.

دنیا هەموو وەك یەك پڕ میحنەت و غەم ئالوود

بیستوومە کەس لەدنیا ڕۆژی بگاتە مەقسوود

تەرجیح بکەن لە بەینی خۆتان یەکی لە هەردوو

زۆر زەمە کە من بلێم پێ ڕابگەم وەها زوو

غەیرەز دوعا و دیاری حازر نەبوو لەلامان

عەرزم قبووڵە قوربان عەفو بکەن خەتامان

مەخصوص عەریزەکانم وا قۆڕ بێ سەروپا

تەقدیم ئەکەم بزانە نەماوە فیکری ئینشا

نەظمی (سلیس کەردی) هەرزان و بێ بەهایە

گەر بێ ڕوخان بفەرموون ئەمجارە وەهایە

بۆ هەر کەسێ دەپرسێ تەبلیغ بکەن سەلامم

گەر پێم نەڵێن بێ بەیتە هێشتا ماوە کەلامم

حاسیل رجام وەهایە عاجز نەبن لە (نوری)

دۆستێکی زۆر قەدیمە یارێکی دوور بە دووری

## شیعری حاجی مەلا محەمەد نور:

### ( مووی سپی لە ریشت ) [1]

مووکێشی ریشی تۆیە وا پێت ئـەڵێ نەمـا موو

لەشکر کـە زۆری هێنا ریشت لە دەستت دەرچوو

دەربێنی یـان نەهێنی مـووی سپی لـە ریشت

وا پێت ئەڵێ لـەشکر هـات کاکۆ شلۆقە ئیشت

مـووی سپی دەربێنی وا پێت ئـەڵێ بە فـریـاد

بێ فایدەیە برادەر لـەشکر گـەیشتە ئیمداد

مووی سپی لـە کفنت داوێکە وەك نیشـانە

چی هەڵکەنی بە مووکێش چی هەڵکەنی بە شانە

رەنگی بکەی بە وەسمە یـا مووی سپی هەڵکەنی

پاشی هـەر رۆژ نەبینی ریشت بە تـوو پێکەنی

---

[1] - هەمان سەرچاوە: گۆڤاری کاروان. لاپەڕە ١٦.

## شیعری حاجی مەلا محەمەد نور[*] :

ئەڵێم دولبەر بکەم بۆنت ئیتر مەیلی گوڵاو ناکەم
بە کوردی پێم ئەڵێی لاچۆ ئەمن دووی خۆم گڵاو ناکەم

لە لەعلی لێوی گوڵناری عەجەب شیرو شەکەر باری
لە ترسی زولفی ڕەشماری بە شەو فکرم بڵاو ناکەم

لە سیحری چاوو ئەبرۆتە گەهێ تاق گەهێ جووتە
لە حەسرەت خاڵی سەر رووتە کە سەر رووتم کڵاو ناکەم

بە سەرخۆشی دڵ و جەرگم نیساری مەقدەمی ڕێی کرد
ئەڵێی لابەن بە کوللی ئارەزووی گۆشتی گڵاو ناکەم

مەڵێی ئەم رووت و قووتە، عاشقی بێ قووتی سەر رووتە
کە رووی توو قووتە بۆ من، ئارەزووی قیمەو پڵاو ناکەم

لە ناو روخسارو زولفی کەوتمە گێژی خەیاڵاتی
کە تێکەڵ بووم ئەفەرمووی من لە مردوو قەت سڵاو ناکەم

ئەگەر چی جەزرەبەی داوم، بەڵام دیسان ئەڵێ (نووری)
ئەگەر بێڵێ بکەم بۆنی ئیتر مەیلی گوڵاو ناکە

---

[*] - بە سوپاسەوە کاک شێخ عوبێد بەرزنجی ئەم شیعرەی بۆ ناردم. جێی باسە ئەم شیعرە بۆ یەکەم جار لەلایەن بەڕێزیانەوە لە گۆڤاری ڕەنگین، ژمارە ٦٥، ساڵی ١٩٩٤. لە ژێر ناز ناوی (غەزەلێکی بڵاونەکراوەی نووری) بڵاوکراوەتەوە.....نووسەر.

## شیعری حاجی مەلا محەمەد نور بە چوار زمان[1] :

کوردی:

تــوو خۆت گوڵی* ، بە ڕەنگ و بۆ،ئاسکی چینی،توخوا مەڕۆ
بە ڕەنگ و بۆ، کــەس نەیدیوە، وەك دڵبەرم، وا سەربەخۆ
ئاسکی چینی، وەك دڵبەرم، نەیدیوە کــەس، بێ گفتوگۆ
توخوا مەڕۆ، وا سەربەخۆ، بێ گفتوگۆ، ناگــەم بـــە تۆ

عەرەبی:

ارحم بنـــا، یـــا ذالوفـــا، في قـــربکـــم، عین الشفا
یا ذالوفـــا، حـــل الجفـــا، داء الهواء، فینـــا کفی
في قربکـــم، داء الهواء، في بعدکـــم، نـــار الجفـــا
عین الشفـــا، فینـــا کفی، نار الجفـــا، این الوفـــا

فارسی:

ای سروری، صـــاحب شـــرف، تیری تـــورا، دل چـــون هـــدف
صاحب شـــرف، از بحری تـــو، دل پـــارەشد، جانم بکف
تیری تـــــورا، دل پـــارەشد، روح روان، خیـــری خلف
دل چـــون هدف، جـــانم بکف، خیری خلف، تـاکـەی اسف

تورکی:

گیل دلبرم، ایت برنظر، قـــان اولدی هب، جـــان و جگر
ایت برنظر، جانـــان اول، جـــانی حزین، ایتمە هـــدر
قان اولـدی هب، جـــانی حزین، دریا گیبی، اولـــدی خطر
جـــان و جگر، ایتمە هـــدر، اولـــدی خطر، یوزبیك کـــدر

---

[1] - بڕوانە: گۆڤاری کاروان، لاپەڕە ١٣.

* - هەر کەسێك هەندێ شارەزایی لە شیعردا هەبێ، دەزانێ شاعیر خاوەن چ توانایەك بووەو چەن جوان دایڕشتووە کە بە ئاسۆیی و شاقوولی دەخوێندرێتەوەو مانای تەواو دەبەخشێت.

# له باره‌ی ژیاننامه و شیعره‌کانی

# (حاجی مه‌لا محه‌مه‌د نور) ه‌وه

له کۆتایی ساڵی ١٩٨٩ جارێ چوومه دیده‌نی مه‌لا ئه‌حمه‌د کوڕی حاجی مه‌لا محه‌مه‌د نور ئه‌و کاته ماڵی له گه‌ڕه‌کی ئیسکانی تازه بوو، په‌یوه‌ندی من له‌گه‌ڵ مه‌لا ئه‌حمه‌د ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ سه‌ره‌تای ساڵانی په‌نجاکانی سه‌ده‌ی رابردوو، له گه‌ڕه‌کی (ته‌په) ی مه‌لا عه‌بدوڵڵا دراوسێی یه‌ك بووین، مه‌لا ئه‌حمه‌د و مه‌لا محه‌مه‌د نوری باوکی شاعیر له‌گه‌ڵ لوتفی باوکمدا دۆستایه‌تیان له نێواندا هه‌بووه و ئه‌و دۆستایه‌تیه تا ئه‌مڕۆ به‌رده‌وامه، جا له‌دوای هه‌ندێ گفتوگۆکردن باسه‌که چووه سه‌ر مه‌سه‌له‌ی ئه‌ده‌بیات، له ئه‌سڵا من نه‌مده‌زانی باوکی مامۆستا مه‌لا ئه‌حمه‌د شاعیره که باسی بۆم کرد، منیش وتم مامۆستا چۆن تا ئه‌مڕۆ ئه‌و به‌رهه‌مانه‌ی باوکت نه‌نووسیوه‌ته‌وه، وتی: وه‌ڵڵاهی کاکه شێخ عوبێد ئیتر له‌به‌ر که‌م ته‌رخه‌می نه‌متوانیوه بڵاوی بکه‌مه‌وه.

ئه‌م ده‌ستنووسانه زانیاری باشی له خۆگرتووه ئه‌گه‌ر ده‌توانی ده‌تده‌مێ بۆمانی بڵاوکه‌یته‌وه، منیش وتم: به‌سه‌رچاو من له‌گه‌ڵ ڕۆژنامه‌و گۆڤاره‌کاندا په‌یوه‌ندی نووسینم هه‌یه، جا کاتێ هێنای و منیش بردمه‌وه بۆ ماڵ ده‌ستم کرد به نووسینیان، به‌شی کوردێکه‌ی بریتی بوو له (٩) پارچه شیعرو به‌شی فارسێکه‌یشی (١١) پارچه شیعر که سه‌رجه‌میان ده‌کاته (٢٠) پارچه شیعر.

به‌شی کوردییه‌که‌ی بریتیه له‌م (٩) پارچه‌یه به ناونیشانی:

١- تۆ خۆت گوڵی

٢- سیحری چاوت

٣- گه‌ڵێ شوکری خوداکه‌ن

٤- شین بۆ کۆچی دوایی مه‌لا محه‌مه‌دی کۆیی

٥- شین بۆ کۆچی شێخ محه‌مه‌د عه‌لی

٦- سه‌ر له‌وحه‌ی عه‌ریزه‌م

٧- مووی سپیی له ریشت

٨- ئه‌ڵێم دولبه‌ر

٩- گه‌ر خودا (غه‌م شکا)

بەڵام بەشی فارسییەکەی کە بریتی بوو لە (١١) پارچە شیعر ئەمانەن:

١- از جگر سوزی

٢- در یك نظر

٣- تونم برز هوشیاری

٤- در اقلیم ملاحت

٥- شمس دا افلاك

٦- زان درد

٧- بو علی

٨- بیمار را در دمان

٩- ای مفخری

١٠- شك بدل

١١- حاجی مکن

ئەم شیعرانە لە ناو یەك دوو دەفتەری قەوارە بچوکی پەر پووت نووسرابۆوە، منیش ماوەیەکی زۆر خەریکی بووم چونکە چەن جۆرە بابەتی دیکەی تێدا نووسرابوو لەوانە: چەند پارچە شیعری ئەم شاعیرانەی لای خوارەوەی تیابوو وەکو: (حاجی قادری کۆیی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی و حەریق و وەفایی و نالی و چەند شاعیری دیکەی نەناسراو وەکو: خالید، غەریق و........هتد، لە پێشەکی کەیدا بە درێژی باسم کردووە، جا لەدوای پاکنووس کردنی لەساڵی ١٩٩٠ز بەشی کوردێکەی و ژیاننامەی شاعیر، ناردم بۆ گۆڤاری کاروان لە هەولێر لە ژمارەی (٨٤) گۆڤاری کارواندا بڵاوی کردەوە و سوپاس نامەیەکی تایبەتیم بۆ هات لەلایەن دەستەی بەڕێوەبەرانی گۆڤاری ناوبراو.

دواتر لەساڵی ١٩٩٤ز پارچە شیعرێکی بڵاونەکراوەی (نووری) بەناوی ((ئەڵێم دولبەر)) بڵاوکردەوە، ئەنجا ژیاننامەی شاعیر لە گۆڤاری گزنگ ژمارە (٣٤) ساڵی ٢٠٠٦ز بڵاوکردەوە لە ژێر ناوی شاعیرێکی نا دیاری دەڤەری کەرکوك، لەم دواییە هاتمە سەر ئەوەی کە هەموویم تایپ کردو بە هۆی دەزگای شەفەق لە چاپی بدەم، ڕۆژێ یەکێکم بینی وتی: لای فلانە کەس هەندێ شیعری (نووری) لایە، منیش جوابم بۆ نارد کە ئەو شیعرانەم بداتێ، چونکە من دیوانەکەم ئامادە کردووە چاپی بکەم، لە وەڵامدا وتبووی من خۆم چاپی دەکەم، ئەنجا هەر بەو برادەرەدا وتم: پێی بڵێ دەچم بۆلای ئەگەر شیعرو زانیاری زیاتری لەلابوو دەربارەی

شاعیر، ئەوە من هەمووو ئەو شتانەی لامە دەیدەمێ، خۆ ئەگەر کەمتر بوو با بمان داتێ، بەڵام بەداخەوە وەڵام نەبوو، هەروەها جارێك فوئادی کوڕی مەلا ئەحمەد هات بۆلام وتی: هەندێ شتم لایە دەربارەی باپیرەم هەمووت بۆ دێنم، منیش وتم زۆر باشە، لە پاشان چەند تەلەفۆنم بۆ کرد ئەویش هیچ وەڵامێکی نەبوو، ڕۆژێ کاك عوبێد عەلی مەولود و کاك سەرکەوت هاتن بۆ ماڵ، هەر بۆ هەمان مەبەست، بەڵام وتم خۆم بەنیازم چاپی بکەم بۆیە داوای لێبوردن دەکەم، بەڵام لە ڕاستیدا هەر چاوەڕوانی ئەو دوو برادەرەم دەکرد، بەڵام هیچی لێ شین نەبوو، لەم دواییە کاك شێخ سیروان هات بۆلام وتی: بە نیازین لەگەڵ کاك سەرکەوت کتێبێك لە بارەی مەلا ئەحمەدی کوڕو حاجی مەلا محەمەد نور بنووسینەوەو لەو بارەوە زانیاریمان کۆکردۆتەوە، ئەگەر بەڕێزتان هاوکاریمان بکەن بۆ ئەوەی ئەم کتێبە زیاتر دەوڵەمەند بێ، منیش وتم: کارێکی باشتان ئەنجامداوەو ئەوا شیعرە فارسیەکانت بۆ ئامادە دەکەم، بە هیوام سەرکەوتووبن لە کارەکەتان و بۆ خزمەتی میللەتی کورد......

**عوبێد شێخ لەتیف بەرزنجی**

**١٣ / ٨ / ٢٠١٦ - کەرکوك**



**لە ڕاستەوە: مەلا ئەحمەد کوڕی حاجی مەلا محەمەد نور**

**لەگەڵ شاعیر و نووسەر شێخ عوبێد بەرزنجی.**

**ئەم وێنەیە لە ساڵی ١٩٩٠ لە ماڵی شێخ عوبێد گیراوە**

**تێبینی:**

خوێنەری بەڕێز: سەبارەت بەشیعرە فارسییەکانی حاجی مەلا محەمەد نور، دەمەوێ ئەوە بڵێم: نووسەر عوبێد شێخ لەتیف بەرزنجی لە باسەکەی خۆیدا ئاماژەی بە (١١) پارچە شیعری فارسی کردووە، بەڵام لەبەر نا تەواوی وشەکان بە پێویستم زانی تەنها شەش لە شیعرەکانی ناوبراو بڵاوبکەینەوە، چونکە شیعرەکان دەسخەت نین و لە کاتی خۆی زۆربەی وشەکان بە هەڵە تایپ کراون، بۆیە دەبینین کەموکورتی پێوە دیارە و ئێمە لێرەدا (٦) پارچە شیعری لێ بڵاودەکەینەوە، کە لەلایەن برای بەڕێزم نزار محەمەد سابیر (نزار کەرکوکی) لە فارسییەوە وەریگێڕاوە بۆ کوردی:

**فارسی:**

**(از جگر سوزی)**

از جگـــر سوزی بگفتم این سخن
در خیلاف ایـــن سخن بیند محن
گـــر بمجهودی سخن داری قبول
چون رازت عرض کردم بر فضول
گرچه داعی در حضورت بی ادب
گشت لیکن هـــر سخن دارد سبب
هر ادب گشتم رجـــــا دارم زتو
عفو فرمـــــای فضولی گفت و گو
پند (نوری) بشنوی یـــا نشنوی
عرض کـــــردم در سیاق مثنوی
این نصیحت از رسول امـــد پیام
هوشداری گــــــوشداری والسلام

کوردی:

## ((له جگەر سۆزییەوە))

لـــە جگەرێکی ســووتـــاوەوە ئـــەم وتەیـــەم درکـاند
پێچەوانـەی ئـــەم وتەیە دوچـــاری ســـەرئێشە دەبێت
گەر هـــەوڵ و تـــەقـــەلای وتــەت قـــەبـــووڵـــە
هەروەك رازو نیـــــازم خستیتە ڕوو لـــەڕووی فزووڵـــەوە
گەرچی داواکار لـــــە حـــزوورتدا بێ ئـــەدەبی نـــواند
بەڵام هـــەر وتەیـــەك هـــۆیـــەکی هـــەیـــە
ئەدەبـــــــم نـــــوانـــــدو تکـــــاکـــــارم لێت
عەفـــووم بفـــەرمووێت کـه خۆم لـــە وتووێژدا هەڵقوڕتاند
پـــەنـــدی (نـــووری) ببیـــسی یـــــان نـــەبیسی
له سیاقی مەسنـــەویدا (شیعری جووت قافیە) دا خستمە ڕوو
ئەم راوێژە لـــە پێغـــەمبەرەوە هـــــات وەك پەیـــام
ئـاگـــــــــــــادری و گـــــوێدێـری و ســـــەلام

فارسی:

## ( در یك نظر )

در یك نظر چـــون زده صد تیر بـــر دلزار
نـایـد بکـــس راویش خبر روی خـــوب دلدار
زار بزار دارم از هجـــر روی گلنــــار خـــوبت
ایا بود کــــه روزی راهـــم دهـــد بگلزار
لرزان ز هجـــرم سر تـــا قـــدم شمع وار
شرح فراق نـایـد بــــا صد زبـــان درشمار
هرباد غم زنـــد مـــوج ابش زراه جـــاری
صبر و شکیب ســـوزد دوری زروی گـلنـــــار
از حال ما تـو اگـــاه گاهی شوی گـــه نـاگاه
چاکم چو سـینه واشد برخاك رسمینت اسرار
ای افـتـاب خوبـــــان صد جـــان ما قـربـان
هیجری وصـــال رویت رمــــزی زجنت و نـار
روزی کـــه جمالت دادی زکـــــاه چون مالت
محروم از این نوالت (نــــوری) فقیر مگزار

کوردی:

## (( لە یەك نیگادا ))

لە یەك نیگایـــەكدا كـــاتێك ســەد تیر بـــەر دڵی زار كــــەوت
كەس نـاتـوانێت دەنگـــو بـــاسی بـــاشی رووخساری یـــار بگێڕێتەوە
لەگـــریە و زاردام لـــە دووری رووخســـاری گـوڵ هەنـــارە بـاشەكەت
ئـــایـــا دەبێت رۆژێك مۆڵەتی چوونە نـــاو گوڵزارەكەم بداتێ
وەك مۆمی داگیرســاو لـــە دەست دووری سەرتـــا پـــا دەهەژێم
شەرحی جـــوودایی بە ســـەد زمـــان لـــەژمـــارە نـایـــەت
هەر بـــــای خـــەم لێی دەدات و شە پۆلی نـــاویشی رەوانـــە
سەبر و تـاقەت، سووتـــاوی دەستی دووری رووی گـــوڵ هەنـــارن
لە حاڵی ئێمە جـــار جـار ئاگـــادر دەبێت و جـــار جـاریش نا
پارچەیەك لەدڵمەوە جیا دەبێتەوە كە بەشێكە لەخاكی نهێنیەكانت
ئەی هەتـــاوی چاكـــان سەد جـــار بە قوربـــانت ببین
دووری لـــە ویســـاڵی روخسارت سونبولێكە لـــە بەهەشت و دۆزەخ
ئەو رۆژەی لـــە مولكی جـــەمـــــاڵت زەكـــــاتت بەخشی
(تـــووری) ی هـەژاریش لـــەو بەشەت مەحـــرووم مـــەكـــە

فارسی:

## ( جنونم برز هوشیاری )

جنونم برز هوشیــاری دراین نیرنگ عه‌یـــاری
بجز درد فـراوانت ز هـوشیـــاری چـه‌میداری
دراین دنیا بسی خـوردم غـم واخر بسر بـردم
ولی صدبـــار رو زردم پشمـــانــم ز بدکـــاری
بیـــا در مجلیسی رنـدان ببین دلهادر او حیران
زلوم و طعن بـــد گویـــان اگـــربیم نمیداری
بگـــردابی چو درمــــانی دراین دنیاز انسانی
مجوهــر شـــاه گیلانی اگـــر شورش صبرداری
بگوشاهی و گـرمـاهی و یـا شمس و فلك جاهی
دلیلم شوز گـــومراهی چــو تو شمع شب تـاری
بدرگـــاهت رجـا دارم زدست نفس بد کـــارم
رها فرمـــاکه بیچارم تلطف به خون کـاری
دیگر زاری مکن ( نوری ) اگـــر چی مور منفوری
سلیمانت همی جوید چو خوش الحان و گفتاری

کوردی:

## (( دێوانەییم باڵای هۆشارییە ))

دێوانەییم هۆشیـــارییەکی باڵایە لـــەم فـرت و فێڵە هـەڵـە شەیەدا

بێجگە لـــە دەردێکی فراوان لـــە هۆشیـــاری چیت دەست کـــەوتووە

لەم دونیـایـــەدا خەمی زۆرم خـــواردو تــــاکۆتاییم بەســەر بــرد

بەڵام سەد جـــار ڕوو زەردم و لــــە بەدکــــاری پەشیمانــــــم

وەرە بـــۆ مەجلیسی رەنــدان ئەو دڵانە ببینە کــــە حەیـــــرانـن

لە لــــۆمـــەو تــانــەی بەدگۆیـــــان ئەگـــەر تـــرست نییە

لەبەر ئەوەی هەر مرۆڤیت لـــە گێژاوی ئەم دونیایەدا گیرت خورادووە

شاهی گەیلانی بە کرۆکی (خاوەن کاکڵەیت) ئەگەر تاسەی سەبرت هەیە

بڵێ شایت و ئەگەر مانگیت وەیـا خورشیدو مەقــامت لـــە گەردووندایە

ڕێنماییم بکـە لـــە گـومـڕاییدا چونکـە تـۆ مۆمـی شەوی تـــاریکی

بە دەرگـــــات تکــــاکــارم لـــــــە دەستی نەفسی بە دکــارم

وەك ئەوەی لـــوتف بـــە خوێن ڕێژێك بکـــەیت ئــــــازادم بکە

ئیتر مەناڵێنە (نوری) ئەگـــەر چی مێروولـــەیەکی نەفرەت لێکراوی

سلێمانەکەت بە دوات دەگـــەڕێت چـــونکە خـــۆش ئـــاوازو گـوفتاری

فارسی:

## ( در اقلیم ملاحت )

در اقلیم مـــلاحت شـد ختـــم حکمـــرانی
بفر ماهی چه میخوانی کـه‌در کونین سلطانی
ز خلق عالــم و ادم تــو بـــودی علت و مقصد
چون نـامت را شفیع اورد سزا شد عفو یزدانی
بطوفانی بلاگشتی چو نوحه‌ی نوح درگشتی
نجاتت نـــام اوشد اگـــر درموج طوفـــانی
محبت بـود دخیل اســا مترس از اتش اعــدا
ز سرحب تــاهـــا شــد بسـرد لهب نیرانی

کوردی:

## (( لە هەرێمی نمەکداری )) دا

لە هەرێمی جوانی و نمەکداریدا فەرمـــانڕەوایی بە بــــالآی تــۆدا بــڕا بفەرمــــوون چیتـــان دەوێت کـــە لــــە هــەردوو گـــەردوونـــدا سوڵتانن لە ئافــراندنی جیهـان و ئــــادەم دا، تــۆ بوویت هــۆکــــارو مەبـــەست چونکە ناوی بە شەفیع هێنایت، لێبوردنی یەزدانی بــوو بە پاداشتێك بۆ ئـادەم کە نــووح تــووشی لافــــاوی بــەلآ بــــوو هـــاواری بـــۆ هێنـــــای بردنی ناوی تۆ بــوو لـــــــە شە پۆلی لافــــاوەکــــە رزگـــــاری کـــرد هەر مەحەببەتی تۆ بووە دەخیلێك بۆ (( ابراهیم )) کە نەترسا لە ئاگری دوژمنان لە نهێنی خۆشەویستی ( تەها ) بوو، کە نێڵەکە دامرکایەوەو ئاگرەکە سارد بووەوە

فارسی:

## ( شمس و افلاک )

شمس و افلاک و فطـــانت مخـــزن فضل و هنر
خسروی ادراک عرفـــان مـــزدهء از خیر و فر
زین همه فـــرهنگی دانش تـــو داری از خـــدا
میچکد از حسـرتت بـــرخداوند از خـــون جگر
هر کـــه جنت را نخواهد جان او بـــاشد سقر
از فصاحت شاعـــرانـــدا خـــود مقطع گشتید
و از بلاغت طالبـــان را نیست غیر تو مفتخر
از فتاحت ثـــانی علامهء چـــون جلال زکـــاوت
موم گرد قاصد بعد یـــاذ الکمال از وصف تو
گر مطول دفتر ســـــازم نمـــایـــد مختصـــر
طبع ( نورالدین ) زمدحت گشته بروزن و لطیف
ورنـــه سحـــر جـــلالـــت انیست جـــای شعرتر

کوردی:

## (( خورشید و گەردوون ))

خورشیدو گەردوون و لێهاتوویی، کۆگـــــای فەزڵ و هونـەر
خوسرەوی دەرکـــی زانین، پـــاداشتێکی لـــــە پیت و فەڕی
ئەم هــــەموو فەرهــــەنگی زانینەت لــــە خوداوە هەیە
لە حەسرەتتدا خوێنی جگــەر بەسەر خــــوداوەندا دەتکێت
هەر کەسێك بەهەشتی نەوێت گیـانی دەبێتە یەك پارچە ئـاگر
بوویتە پارچـەیـەك لـــــەزمان پـــــاراویی شـــاعیراندا
لە داواکارانی ڕەوانبێژی بێجگە لــــە تۆ مایەی شانـــازی نییە
لە ڕووی بیری داهێنەرانەی تــۆ (ابن الحجر) بوو بـــــە مۆم
ناوەزی ڕەهــــا لــــە وەسفی تــۆدا کـــورتی هێنـــاوە
گەر پەڕاوێکی تووڵانی دابڕێژم هــەرگیز بۆم کورت ناکرێتەوە
خـــووی (نورەدین) لـــــە ستـــــایشت نـــاسـك و بـــەکێشە
وەگەرنا بۆ ئەفسوونی مەزنیت جێی شیعری تەڕو تازە نابێتەوە

فارسی:

## ( حاجی مکن )

حاجی مکن بر چـه فکـری میروی

میخواهی کــه روی مــردم شوی

همنشن کودکـــان تـــاکی کنی

لاف عقل و علم و عرفــان میزنی

گرکنی تــرجیح عقل کــودکان

مینمای بر دوش خــود بارگران

صبحت عالم اگــر افتد بد است

صبحت جاهل بجاهل بس بد است

پیش ازاین احــوال خـود ازر بیاد

گر نخـواهی عمـر را دادن ببـاد

مردجو مــردانه بـــاش و حق بگو

انچه گویم بهر خــود یـــا بهر تو

از دنی دنیـــا بدونی بـــر مخور

نزد هــر کسی ابروی خـــود مبر

چون وفـــاداری نداند این خسیس

شکر کن بـــر صبحتی شیخ رئیس

شیخ معــروف بــدائـــم همنشین

زنده گشتی از رمــوزی محی الدین

بر جمــال چـون عـزیـز هــر لئیم

بنگـرد بـاشـد بـدل عبـدی کـریـم

در شمـائیل چـون مطهر طاهر است

اهل وبیتی در جنتیش ظاهــر است

کوردی:

## ((حاجی مەکە))

حاجی مـــەکــە بـــەرەو چ هــزرێك دەڕۆیت

دەتـەوێت رووبــەڕووی خـــــەڵك بیتەوە

تـاکــەی هـــــاونشینی منــدالآن دمکــەیت

لافی عــەقـــڵ و زانین و زانـــست لێدەدەیت

گەر تــەرجیــحی عــــەقـلی مندالآن بکـەیت

باری سەر شـانی خــۆت ســەنگین دەکـــەیت

وتەی زانــا گــــەر لـــەسەری بکەوێت بـەدە

لەوە بەدتـــر لێدوانی نــەزانێکە بــۆ نەزانێك

پێش ئــەمـە دۆخــی خـــــۆت بنــــرخێنە

گەر نەتــــەوێت تەمــەن بــەر بــــا بــدەیت

بە دوای پیـــاو بگـەڕێ و پیاوانــە بەو حــەق بڵێ

ئەوەی دەیڵێم لــــــە رێی خــۆم و بــۆ تــۆیشە

هەڵەخـەڵــەتێ بــە بــەدیی دونیــای دون

لای هەرکـــەسێکیش ئــابــڕووی خــۆت مـەبـە

چونکـە وەفــاداری نــازانێت ئــەم خـەسیسە

سوپـاسی قسەو سوحبـەتی شێخی ســەرۆك بکـە

شێخی ئـــــــاودار هــــەمیشە هـــاونشینە

زینـدو بوویتەوە بـە سونبونگـەلی ژێنەرەوەی ئـایین

جەماڵی وەك عەزیز (ئازیز) هەر بەدێك (ناتەواوە)

بڕوانێت بــــە دڵ کۆیلەی خـــــودا (کـەریـم)

لە خەسڵەت گــەل دا وەك پاقـژ کراوێك خــاوێنە

بنەمـاڵەکەیشی لـــە بەهەشتی بوونیان ئـاشکرایە




**مەلای گەورە - لەم بەرگەدا باس لە مەلا ئەحمەدی کوڕ دەکات**



**بڕوانامەی مەلا محمد صالح کوڕی مەلا عمر ئۆمەر گومبەتی – لە زانکۆی ئەزهەر ساڵی ١٩٥٨**





**ئەمە دەستنووسێکی ( حاجی مەلا محمد نور )ە، کە بریتییە لە وەرگێڕانی وشەی کوردی ، عەرەبی ، تورکی. بە هەڵبەست و شێوەکی جوان و پوخت لە ساڵی ١٣٢٣ ی کۆچی بەرامبەر بە ساڵی ١٩٠٥ زایینی ئەم فەرهەنگەی نووسیوە.**



حەمە غەریب کوڕی مەلا ئەحمەدی کۆر

١٩٩٨ کۆچی دوایی کردووە



مامۆستا مەلا عەبدولحەمید

کوڕی مەلا عەبدوڵڵا کوڕی ئەحمەدی کۆر



له ڕاستەوە: محەمەد نەجیب کوڕی مەلا محەمەد نور- مەلا فاتیح
کوڕی مەلا نور محەمەد- حەمە غەریب کوڕی مەلا ئەحمەدی کۆر



مەلا ئەحمەد کوڕی مەلا محەمەد نور کوڕی مەلا ئەحمەدی کۆر



محەمەد نەجیب کوڕی مەلا محەمەد نور کوڕی مەلا ئەحمەدی کۆر



سەرکەوت محەمەد نەجیب – لەسەر ئارامگەی باپیری ( حاجی

مەلا محەمەد نور ) کوڕی مەلا ئەحمەدی کۆر- وەکاشە



**له ڕاستەوە: مەلا محەمەد سالْح – م. عەبدولقادر كوڕى مەلا عومەر ئۆمەر گومبەتی- خانەقای مەلا عومەر ئۆمەر گومبەتی - کەرکوك**



**له ڕاستەوە: عبدالمجید مەلا عبدالله - عزیز خۆشناو م. مەلا عبدالحمید مەلا عبدالله مەلا ئەحمەدی کۆر.**



مامۆستا مەلا صدیق ئۆمەر گومبەتی



لە ڕاستەوە: مەلا محمود عەرەب – مەلا عومەر
ئۆمەر گومبەتی – مزگەوتی ئیمام قاسم




ئەم وێنەیە لە نەورۆزی ١٩٦٨ گیراوە- وێنەی ژمارە ( ١ ) مەلا فاتیح مەلا
نور محەمەد - وێنەی ژمارە ( ٢ ) شاڵاو عەلی عەسکەری.



لە ڕاستەوە: نووسەر – مەلا محمد صالح مەلا عمر گومبەتی – شێخ حسێن
بەرزنجی. ئەم وێنەیە لە ساڵی ٢٠١٢ لە ماڵی مەلا محمد صالح گیراوە.



مەلا ئەحمەد كوڕی مەلا محەمەد نور
كوڕی مەلا ئەحمەدی كۆر



عبدالمجید كوڕی مەلا عبداللە كوڕی
مەلا ئەحمەدی كۆر



**له ڕاستەوە: نووسەر – کاکە حەمەی مامە شێخ – سەرکەوت محمد نجیب**



**له ڕاستەوە: سەرکەوت محمد نجیب – شێخ حسێن بەرزنجی - نووسەر**



له ڕاستەوە: سەرکەوت محمد نجیب – د. قارەمان شێخ بزێنی- د. مەلا جەمال باجەلان- م. کاکەخان - نووسەر



له ڕاستەوە: م. ئیدریس عبدالله ئۆمەر گومبەت - سەرکەوت محمد نجیب - نووسەر



**لە ڕاستەوە: سەرکەوت محمد نجیب - مەلا ئەحمەد کوڕی مەلا محەمەد نور - نووسەر**



**لە ڕاستەوە: نووسەر - مەلا شاخی - سەرکەوت محمد نجیب**



ئارامگەی حاجی قادری کۆیی – لە وڵاتی تورکیا.

ئەم وێنەیە بۆ یەکەم جارە بڵاو دەبێتەوە. لە ئەرشیفی م. ئیدریس عبداللە نۆمەر گومبەت وەرگیراوە.



ئارامگای مامۆستا مەلا ئەحمەدی کۆر – گوندی نۆمەر گومبەت



له راسته‌وه: نووسه‌ر له‌گه‌ڵ کاك سه‌رکه‌وت محمد نجيب
پێش مزگه‌وتی ئۆمه‌ر گومبه‌ت- له گوندی ئۆمه‌ر گومبه‌ت



له راسته‌وه: شاعیر و نووسه‌ر شێخ عوبێد به‌رزنجی - نووسه‌ر



له راستەوە: سەرکەوت محمد نەجیب – شهاب مام ئیبراهیم
چالی (جۆنی گەنم کوتان)- له گوندی گۆر قەرەج



له ڕاستەوە: عوبێد عەلی مەولود، سەرکەوت محمد نجیب، محەمەد پێشمەرگەی دێرین ناسراو به (توانا)، شێخ بورهان چوارداخی و سیروان سەرگەڵوویی و شاعیر شوان مەندی و نووسەر نزار کەرکوکی و چیرۆکنووس فەیسەڵ هەمەوەندی و شاعیر خالید کاوێس. ئەم وێنەیه له گفتوگۆیەکی تایبەتدا سەبارت بە شیعرەکانی مەلا ئەحمەدی کۆر گیراوە. شوێن- قاوەخانەی (ئەفەندی) شەوی هەینی ٣٠ / ٦ / ٢٠١٦



**له راستەوە: سەرکەوت محمد نەجیب – نووسەر**
**لە بەردەم پەیکەری حاجی قادری کۆیی- تەق تەق**

# ژیاننامەی سەرکەوت محەمەد نەجیب بە پێنووسی خۆی



ناوی تەواوم: (سەرکەوت کوڕی محەمەد نەجیب کوڕی حاجی مەلا محەمەد نور کوڕی مەلا ئەحمەدی کۆر کوڕی بابا ڕەسوڵ) ە، لەساڵی (۱۹٦۲) لە گەڕەکی ئیمام قاسم لە شاری کەرکوك لە دایکبوم، ساڵی (۱۹٦۳) لەبەر ئەوەی باوکم دەستی لە کاری ڕامیاریدا هەبوو بڕیاری گرتنی بۆ دەرچووە لەلایەن ڕژێمی ئەو کاتەوە، ئیدی بە ناچاری ماڵمان گواستەوە بۆ ناوچەی ساڵەیی لە گوندی بیرەسپانی خواروو نیشتەجێ بووین، تا کارەساتی بەدناوەکەی بەعسی خوێن ڕێژەکانی ساڵی (۱۹٦۳) بە ناو (حەرەس قەومی) چەکدارەکانی هەڵیان دەکوتایە سەر خەڵك و دەیان کوشتن و لادێکانیان دەسووتان و ماڵەکانیان بە تاڵان دەبرد، ماڵی ئێمەش بەر ئەو شاڵاوە کەوت، دوای دووبەش بوونی شۆڕش، باوکم دەستی لە کاری ڕامیاری کێشایەوە، لە ساڵی(۱۹٦٤) لە گەڕەکی ڕەحیماوە نیشتەجێ بووین لەبەر ئەوەی (نەنکم، دایکی دایکم نیشتەجێی ڕەحیماوە بوو ئامۆزای کوێخا ڕەحیم غفور) دامەزرێنەری گەڕەکی ناوبراو.

دایکم ناوی (فاتمە ئەمین سەمین) لە بنەماڵەی میر سمایلی زەنگەنەیە)، پاشان باوکم شانی داوەتە بەر کاسبی تا لە ساڵی ۱۹۹۹ لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کردووە لە ئۆردوگای بنەسڵاوە بە خاك سپێردراوە، لەساڵی (۱۹٦۸) خوێندنی سەرەتایم لە (ئاسۆس و ڕەحیماوە) بوو، ناوەندیم لە ئامادەیی (زێوەر) تەواو کردووە، لەساڵی (۱۹۷۹) لە ئامادەیی کشتوکاڵی تەقتەق وەرگیراوم، ئامادەیی کشتوکاڵم تەواو کردووە.

لە ڕێکەوتی (٥ / ۱۲ / ۱۹۷٦) پەیوەندیم بە ڕیکخستنی (ی.ن.ك) باڵی (بزووتنەوەی سۆشیالست دیموکراتی کوردستانەوە) کردووە، لەساڵی ۱۹۷۹ بە دابەش بوونی بزووتنەوە

پەیوەنـدیم پچـڕا، لەسـاڵی (١٩٨٢) پەیوەنـدیم کـردووە بـە بـاڵی کۆمەڵـەی ڕەنجـدەرانی کوردستانەوە، لە هەمان ساڵدا بەشـداری ڕاپـەڕینی یـادی کارەسـاتە خوێناوەکەی (٢٤ / ٤ / ١٩٧٤) قەڵادزێم کردووە وەك خوێندکار لە شاری کۆیە، لەساڵی (١٩٨٥) بـووم بـە پێشمەرگە لـە تیپـی (٢١) ی کـەرکوك کـەرتی یـەکی سـاڵەیی، لـەژیانی پێشـمەرگایەتی چـەند جـاریٚ بریندار بووم جارێکیان (لوغمم) پێیاتەقیووە. ناسـراوم بـە (سـەرکەوتە شـەل) بـەردەوام بووم بەبێ دابڕان، لەساڵی (١٩٨٩) بەشداری خـولی سـەربازی (گـەیلانی ڕۆژئـاوا) ((گـەیلان غـەرب)) کـردووە، دوای ئـەوە بەشـداری خـولی پـارتیزانی زەڵـێم کـردووە، لەسـاڵی (١٩٩١) بەشداری ڕاپەڕینە مەزنەکەی گەلەکـەمانم بـە ئـازادکردنی شـاری کەرکوکیشـەوە کـردووە، دوای ئـەوە بـووم بـە لێپرسـراوی گـومرکی شـەقڵاوە لەبـەرەی کوردسـتانی، لەسـاڵی (١٩٩٢) لەگەڵ دامەزرانـدنی حکومـەتی هـەرێمی کوردسـتان بـووم بـە ئەفسـەر لـە بەڕێوبەرایـەتی ئاسایشی کەرکوك.

لـە سـاڵی (١٩٩٣) گوازرامـەوە بـۆ بەڕێوەبەرایـەتی ئاسایشـی دهـۆك، لـە سـاڵی (١٩٩٤) لەگـەڵ هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ گەڕاینەوە بۆ هەولێر لە لیوای تایبـەتی مەکتـەبی سیاسـی بـووم بـە فەرمانـدەی (سـریەی مغـاویر)، لـە سـاڵی (١٩٩٥) لـە بەڕێوەبەرایـەتی ئاسایشـی هـەولێر بووم بە لێپرسراوی بنکەی (١٠٤) فریاکەوتن دوایی بنکەی ئاسایشی برایەتی.

لە ڕێکـەوتی (١٧ / ٧ / ١٩٩٥) حزبـی بـەعس بـە هاوکـاری دڵسـۆزانی هێرشـیان کـردە سـەر ئۆردوگای کانی قرژاڵـە و زاڵگـەی نێـوان هـەولێر - موسـڵ بـۆ ڕزگـارکردنی (کـانی قرژاڵـە) هێزی ئاسایشیش بەشدار بوو، دواتر بووم بە فەرماندەی کەرتی ئاسایش لە محوەری کـانی قرژاڵە، دوای ئەوە بووم بە بەڕێوەبەری یاریدەدەرێتی ئاسایشی ئیسکان تا کارەسـاتی (٣١ / ٨ / ١٩٩٦). دوای ئـەوە گەڕامـەوە ئاسایشـی کـەرکوك و لـە ئاسایشـی چەمچـەماڵ درێـژەم بەخزمـەت دا لـە سـاڵی (١٩٩٨) بەشـداری خـولی ئەفسـەرانم کـردووە لـە قەڵاچـۆلان، لـەم شوێنانە خزمەتم کـردووە (تـەکیـە، ئاخجەلـەر، دەربەنـدیخان)، لـە سـاڵی (٢٠٠٠) بەشـداری خولی پەیمانگای کادرانم کردووە لە قەڵاچۆلان، پاشان بووم بە لێپرسراوی زینـدانی گشـتی ئاسایشی گشتی لە سلێمانی، لەساڵی (٢٠٠٢) بەشداری خولی بەرگری شارستانیم کردووە لـە وەزارەتی ناوخۆ، لە ساڵی (٢٠٠٣) لەگەڵ ڕزگـار بـوونی شـاری کـەرکوك دەزگـای ئاسایشـمان گواسـتەوە بـۆ کـەرکوك لەگـەڵ وەسـتا حەسـەن و ئەفسـەر و کارمەنـدانی تـر، بـووم بـە

لێپرسـراوی ئاسایشـی ناوشـار، لـه سـاڵی (٢٠٠٦) بـووم بـه لیپرسـراوی ئاسایشـی دەوروبـەر (قەزاو ناحیەکان).

لە ساڵی (٢٠٠٩) بووم بەلێپرسراوی بەشی پەیوەندییـەکان و بـۆ ماوەیـەك سەرپەرشـتیاری ئاسایشـی موسـەڵا. لـە سـاڵی (٢٠١٢) بـووم بەڕێوەبـەری ئاسایشـی دووبـز، لـە ئێسـتادا لێپرسراوی بەشی پەیوەندییەکانی ئاسایشم لە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی کەرکوك.

## باری خێزانیم:

لە ساڵی (١٩٩٧) خێزانم پێکەوە نـاوە، نـاوی هاوسـەرم (شـلێر رەشـید محەمـەد ئـەمین) لـە عەشیرەتی هەمەوەندە، بەڵام منالی لە بەشا نەبوو، لەبـەر ئـەوە لەسـاڵی (٢٠٠٩) هاوسـەری دووەمم هەڵبژارد بە ناوی (ئیبتسام ئیبراهیم نامق) لە عەشیرەتی لوڕە،

لە ڕێکەوتی (١١ / ١١ / ٢٠١٢) خوای گەورە کوڕێکی جوانی پێ بەخشین ناومان نا (ناڵی).

**سەرچاوەكان:**


١- ئەنجومەنی ئەدیبان، دانەر- ئەمین فەیضی بەگ، ١٩٨٣.

٢- بنەماڵەی زانیاران، مەلا عەبدولكەریم مودەڕیس، چاپی یەكەم، ساڵی ١٩٨٤.

٣- پوختەیەك دەربارەی هۆزی شێخانی بەرزنجی، لە نووسینی: محەمەد سەید عەبدولكەریم شێخانی بەرزنجی، چاپخانەی ئەسعەد – بەغدا، ساڵی ١٩٨٨.

٤- اعلام الكرد، جمال بابان، جزء الاول، ٢٠٠٦.

٥- یاداشت، ململانێ لەگەڵ ژیاندا، د.عبدالستار تاهیر شەریف، ساڵی ٢٠٠٨.

٦- تەفسیری كوردی، لە كەلامی خوداوەندی، مەلای گەورە، بەرگی سێیەم، ساڵی ٢٠٠٩.

٧- بڕگەكانی فیستیڤاڵی یادەوەری (مەلای گەورە)، ساڵی ٢٠٠٩.

٨- حەمەغای گەورە، مەسعود محەمەد، ساڵی ٢٠١٠.

٩- مێژووی جەلی زادە، نەجیبە خانی جەلی زادە، ساڵی ٢٠١١.

١٠- شاری كەركوك - بەشێك لە مێژووی مزگەوت و تەكیە و زانا و پیاوە ئایینیە ناودارەكانی - گۆران فەتحی، ساڵی ٢٠١٢.

١١- حاجی كرمانجێك لەوپەڕی مەزنیدا، ئاراس ئیلنجاغی، سلێمانی ٢٠١٢.

١٢- گوڵستان، ژیانی ناوداران و شاعیرانی كورد، ئا: مەلا سامان هەڵەبجە، ساڵی ٢٠١٤.

١٣- ساداتی بەرزنجە، ژیاننامەی پیاوچاكان، بەرگی یەكەم - سیروان سەرگەڵوویی، ساڵی ٢٠١٤.

١٤- مەلا مەعسومی هەورامی، مەلا و زانا و وڵاتپەروەر، د.عوسمان دەشتی، ساڵی ٢٠١٥.

١٥- سەیدەكانی كوردستان و ڕۆڵی گرنگیان لە مێژوودا - عەلائەدین سەید ڕەزا محەمەد سەنگاوی - ساڵی ٢٠١٥.

١٦- سكاڵای خاك، شیعر، سەیفەدین سابیر، ساڵی ٢٠١٥.

١٧- خانەقای سەید ئەحمەد لە ئامێزی مێژوودا، سیروان سەرگەڵوویی، ساڵی ٢٠١٥.

١٨- لە دەروەندەوە هەتا ئەیرە مێژوو، ئیدریس نۆمەر گومەتی، ساڵی ٢٠١٥.

١٩- ڕۆڵی خانەقاكانی باشووری كوردستان، دەستنووس، لە نووسینی: سیروان سەرگەڵوویی، ساڵی ٢٠١٥.

٢٠- هۆزی شێخ بزێنی، م. سەعد فاروق یوسف شێخ بزێنی، هەولێر ٢٠١٥.

٢١- دیوانی حاجی قادری کۆیی، ئیدریس عەبدوڵڵا، چاپی یەکەم، سلێمانی .٢٠١٦

٢٢- دیداری حاجی قادری کۆیی، بەڕێوەبەرایەتی چالاکی وێژەیی سلێمانی، ٢٠١٦.


**گۆڤار و ڕۆژنامەکان:**


٢٣- گۆڤاری کاروان، ژمارە (٨٤) ساڵی ١٩٩٠ .

٢٤- گۆڤاری ڕەنگین، ژمارە (٦٥) ساڵی ١٩٩٤ .

٢٥- گۆڤاری خۆری ئیسلام، ژمارە (٢٥) ساڵی ٢٠٠٤.

٢٦- ڕۆژنامەی تاك، ژمارە (١١) ساڵی .٢٠٠٥

٢٧- ڕۆژنامەی تاك، ژمارە (١٨) ساڵی .٢٠٠٦

٢٨- گۆڤاری گزنگ، ژمارە (٣٤) ساڵی .٢٠٠٦

٢٩- گۆڤاری کەرکوك، ژمارە (٤) ساڵی ٢٠٠٩ .

٣٠- ڕۆژنامەی هەواڵ، ژمارە (٥٠٠) ساڵی .٢٠١٢

٣١- گۆڤاری کرکوك الیوم، ژمارە ٢٧ ساڵی ٢٠١٦.


**سەردان:**


سەردانی: بەڕێز کاك ئەحمەد کوڕی مەلا عەبدولحەمید، قوشتەپە - هەولێر، ڕێکەوتی: ٩ /٦ / ٢٠١٦.

سەردانی: مەزارگەی مەلا عەبدوڵڵای کوڕی مەلا ئەحمەدی کۆر، لە دێی سماقە، ڕێکەوتی: ٧/٢٠ /٢٠١٦ کاتژمێر ١٠ ی بەیانی.

سەردانی: مەزارگەی مەلا ئەحمەدی کۆر، لە گوندی ئۆمەر گومبەت، ڕێکەوتی: ٢٠ / ٧ / ٢٠١٦ کاتژمێر ١٠، ٥٠ خولەك پێش نیوەڕۆ.

سەردانی: برای ئەدیب و نووسەر ئیدریس عەبدوڵڵا ئۆمەر گومبەت، ڕێکەوتی ٢٠ / ٧ / ٢٠١٦ تەقتەق ٣:٢٠ خولەك سەر لە ئێوارە.

سەردانی: مەزارگەی حاجی مەلا محەمەد نور کوڕی مەلا ئەحمەدی کۆر، لە وەکاشە، ڕێکەوتی ٢٠/ ٧ / ٢٠١٦، کاتژمێر ٦:٢٠ خولەك پێش مەغریب.

سەردانی: شاعیرو نووسەر شێخ عوبێد بەرزنجی، کەرکوك، ڕێکەوتی ٢/٨/ ٢٠١٦ کاتـژمێر (٩)ی بەیانی.

سەردانی: کتێبخانەی گشتی کۆیە، ڕۆژی دووشەممە ڕێکەوتی ٥ / ٩ / ٢٠١٦ شارۆچکەی کۆیە.

## چاوپێکەوتن:

چاوپێکەوتنی: مـەلا محەمـەد سالّح کـوڕی مـەلا عومـەری گومبـەتی، ڕێکەوتی ١٠ / ١١ / ٢٠١٢ ئیمام قاسم – کەرکوك.

چاوپێکەوتنی: مەلا شەفیق گۆڵدەرە، لە ڕێکەوتی ٣١ / ١ / ٢٠١٦ رەحیم ئاوا – کەرکوك.

چاوپێکەوتنی: مەلا ئەحمەد کوڕی حاجی مەلا محەمەد نور، ڕۆژی پێنجشەممە ڕیکەوتی ٢٠١٦/٦/٩ دارەتوو- هەولێر.

چاوپێکەوتنی: شێخ بورهان چوارداخی، شەوی هەینی ٣٠ / ٦ / ٢٠١٦ قاوەخانەی ئەفەندی – کەرکوك.

چاوپێکەوتنی: شێخ حەسەن شێخ تاهیر شێخ شەریف، شەوی یەکشەممە ڕێکەوتی ٢٣/٧/ ٢٠١٦ تەپە – کەرکوك.

چاوپێکەوتنی: د. مەلا جەمال محەمەد فەقێ ڕەسوڵ، ڕۆژی دووشەممە ڕێکەوتی ٥ / ٩ / ٢٠١٦ کۆیە.

چاوپێکەوتنی: مامۆستا عەبدولەجید مەلا قادری ڕەش، ڕۆژی دووشەممە ڕێکەوتی ٥ / ٩ / ٢٠١٦ تەقتەق.

چاوپێکەوتنی: مەلا مەحمود عەزیز شێخ بزێنی پێشنوێژ و وتارخوێنی مزگەوتی (عەلی کوڕی ئەبو تالیب)، ڕۆژی سێشەممە ڕێکەوتی ٢٧/ ١٢ / ٢٠١٦، لە خانەقای سەید ئەحمەد – کەرکوك.

چاوپێکەوتنی: کاك محەمەد کوڕی مەلا فاتیح، لە ڕێکەوتی ١٨ / ١ / ٢٠١٧ کەرکوك.

چاوپێکەوتنی: مەلا شاخی، لە ڕێکەوتی ٢٨ / ٣ / ٢٠١٧ سەقزلی – کەرکوك.

چاوپێکەوتنی: شێخ وەهاب شێخ تەها بیرەسپان، لە ڕێکەوتی ١٢ / ٦ / ٢٠١٧ اسری و مفقودین – کەرکوك.

**فەیس بووك:**

**★ کورتە باسێك لە بارەی مەلا حەکیم، لە نووسینی: مەلا ڕێبوار ساڵەیی، ڕێکەوتی ٢٢ / ١ / ٢٠١٧ لە فەیس بووك وەرگیراوە.**

**==============================================================**

**ئەم سەرچاوانە: لە ئەرشیفی، کاك سەرکەوت محەمەد نەجیب وەرگیراوە.**

**شێخ سەدرەدین محێدین حوسێن بەرزنجی ناسراو بە (کاکە حەمەی مامە شێخ).**

**سەید مەلا عەبدولڕەحمان سەید مەلا مەحمود (عەلی بەیانی) پیرخدری.**

**سەید عەبدولکەریم کوڕەزای سەید سلێمان جلبەسەر - سەید نەسرەدین**

**مەلا سدیق ساڵح ئیسماعیل - تەقتەق.**

**مەلا ئیسماعیل سەعید شەریف مەلا محەمەدی گۆج - ڕۆژبەیانی**

# سوپاس و پێزانین

بە پێویستی دەزانم سوپاس و پێزانین ئاراستەی ئەم بەڕێزانە بکرێت کە هاوکارمان بوون، بۆ تەواو کردنی ئەم کتێبە و پێدانی زانیاری ئەو ئازیزانە بوو، کە وایکرد ئەم بەرهەمە بێتە دی، بۆیە وەك وەفایەك دەبێ ئاماژە بە ناوی ئەو بەڕێزانە بکەم:

١- خالید کاوێس، شاعیر و وەرگێڕ.

٢- شێخ عوبێد بەرزنجی (هەوری) بەڕێزیان زۆر هاوکاری کردین و بە سوپاسەوە شیعرە فارسییەکانی حاجی مەلا محەمەد نوری پێداین کە بۆ یەکەم جارە بڵاودەکرێنەوە.

٣- مەلا شاخی، نووسەر و پێشمەرگەی دێرین، زانیاری زۆر گرنگی پێداین و فەرهەنگی حاجی مەلا محەمەد نوری کە بە خەتی خۆی نووسراوە، پێشکەشی کردین.

٤- نزار محەمەد سابیر، نووسەر و وەرگێڕ، ئەم بەڕێزە زۆر هاوکارم بوو، زۆریش ماندوو بوو لەگەڵمدا بەتایبەت شیعرە فارسییەکانی وەرگێڕاوەتە سەر کوردی.

٥- شێخ حوسێن بەرزنجی، ئەدیب و شاعیر و پێشنوێژ و وتارخوێنی مزگەوتی (سەید نورەدین).

٦- د. مەلا جەمال محەمەد فەقێ ڕەسوڵ باجەلان، سەرۆکی بەشی شەریعە لە زانکۆی کۆیە.

٧- م. ئیدریس عەبدوڵڵا ئۆمەر گومەتی، نووسەر.

٨- د. قارەمان نادر شێخ بزێنی، مامۆستا لە زانکۆی کۆیە.

# پێرست



نووسەر

لە کۆیێ دینداریێکی بێ فێڵی بێ مانەند هەبووە ناوی مەلا ئەحمەد بوو، لەبەر چاوی زەعیفی پێی گوتراوە مامۆستا کۆرە، ئەم دیندارە یەکێک بوو کە شۆرەتی ڕاستی و ئیمانی بەلای هەموو کۆیەوە لە گومان بەدەر بووە. مەلا ئەحمەد (مامۆستا کۆرە) لە مریدەکانی بریفکان بووە و بەینێک لەوێ ئاشەوانیی کردووە، کاک ئەحمەدی شێخ لەهەندێ نامەی کە بۆحاجی مەلا عەبدوڵڵای ناردووە دەنووسێ سەلام لە ئاشەوان دەکەم مەبەستی مەلا ئەحمەدە، باوکم بارەها و جارەها مەجلیسی شەوانەی بە باسی مامۆستا کۆرە ڕادەبوارد و عیشقێکی ئەو کوێرەی لەدڵدا بوو هەرگیز کز نەبووەوە

مامۆستا مەسعود محەمەد